ناوی کتێب : سیحر : مەترسی و خۆپاراستن لێی و چۆنێتی هەڵوەشاندنەوەی

نوسینی : د. عبد المحسن بن محمد القاسم

وەرگێرانی : پشتیوان حەسەن کەرەم

نۆرەی چاپ : یەکەم

ساڵی چاپ : (( ١٤٤٥ ک - ٢٠٢٣ ز ))

----------------------

بۆ دەستکەوتنی ئەم کتێبەیە بە کۆ پەیوەندی بکە بەم ژمارەیەوە

٠٧٧٠١٥١٧٣٧٨

يمكن الاطلاع وتحميل جميع مؤلفات فضيلة الشيخ على الرابط:
a-alqasim.com/books/

# سیحر

## مەترسی و خۆپاراستن لێی و چۆنێتی هەڵوەشاندنەوەی


نووسینی

د. عبدالمحسن بن محمد القاسم

إمام وخطيب المسجد النبوي الشريف

وەرگێڕانی

پشتیوان حەسەن کەرەم



لەبڵاوکراوەکانی

(ماڵپەڕی بەهەشت ، ماڵپەڕی وەڵامەکان )

ماڵپەڕی بەهەشت ba٨.org ماڵپەڕی وەڵامەکان walamakan.com

## پێشەکی

**الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِهِ وَأَصْحَابِهِ أَجْمَعِينَ.**

**أَمَّا بَعْدُ:**

سیحر یەکێکە لە لەناوبەرەکانی دین و هۆکارەکانی داڕوخانی کۆمەڵگە و لێکترازانی خێزان، جا لەبەر دووری هەندێ خەڵك لە پەروەردگاریان و ڕازی نەبوونیان بەوەی خوای گەورە بەخۆیان یان خەڵکی تری بەخشیوە، و هەڵکوڵانی ئیرەیی و حەسەد لەناخیاندا بەرانبەر ئەوانی تر، پەنا دەبەنە بەر ئەو کەسەی کە ئامانج و مەبەستیان بەدی بهێنێت بەنیازی خۆیان، بەڵام لای ئەو کەسەی کە بیروباوەڕیان تێك دەدات و تووشی تاوانیان دەکات لە ساحیر و جادووگەر و فاڵچیەکان.

جا ئەمە پەرتووکێکە و ناوم لێ ناوە : «السِّحْرُ؛ خَطَرُهُ - التَّحَصُّنُ مِنْهُ - كَيْفِيَّةُ حَلِّهِ»، واتە: سیحر، مەترسی و خۆپاراستن لێی و چۆنێتی هەڵوەشاندنەوەی. کە تێیدا وریا و ئاگادارکردنەوەی موسڵمانانی تێدایە لە ساحر و جادووگەران و نیاز و مەبەستیان و هەروەها بێدارکەرەوەیەکیشە بۆ ئەو کەسەی کە بیروباوەڕی تێکچووە و هەوڵی ئەوە دەدات کە سیحر لە کەسانی تر بکات، و دڵدانەوە و دڵئارامیشی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی کە سیحریان لێ کراوە و ستەملێکراون بە ئاشناکردنیان بە ڕێگا و شێوازی هەڵوەشاندنەوە و بەتاڵ کردنەوەی سیحرەکەی.

جا داواکارم لە خوای پەروەردگار کە سوودی هەبێت، و موسڵمانانیش بپارێزێت شەڕ و خراپەی ساحیران و فاڵچیان و فێڵ و تەڵەکەیان بخاتە نێو خۆیانەوە و سەرقاڵی دەردی خۆیان بکات.

وصلَّى اللَّهُ وسلَّم علىَ نبيِّنا محمَّدٍ، وعلىَ آلِه وصَحبِه أجمعينَ.

د. عبد المحسن بن محمد القاسم

إمام وخطيب المسجد النبوي الشريف

## پێناسەی سیحر

**سیحر لەڕووی زمانەوە:** بەهەموو شتێك دەوترێت کە هۆکارەکەی شاراوەو نهێنی بێت و ورد و نادیارن بێت[1].

**بەڵام لەڕووی زاراوەوە:** سیحر هەمەجۆرە و ڕێگاکانی جیاوازە و پێناسەیەکی گشتگیری بۆ نییە.

موحەممەد ئەمین شەنقیتی بەڕەحمەت بێت دەڵێت: بزانە کە سیحر لەڕووی زاراوەوە ناتوانرێت پێناسەیەکی گشتگیری بۆ بکرێت و ڕێگریش بێت لەوەی جگە لەخۆی نەیەتە ناویەوە لە پێناسەکەیدا، ئەوەش لەبەر زۆری و هەمەچەشنی جۆرەکانی کە دەچنەژێریەوە، بۆیە ئەندازەیەکی دیاری کراو نییە لەو نێوەندەدا کە بەتەواوەتی سنووربەندی بکات، ئا لێرەوە گوزارشتی زانایان جیاوازبووە لەو بارەیەوە بەشێوەیەکی زۆر[2].

پێشەوا ابن القیم بەڕەحمەت بێت دەڵێت: سیحر بریتیە لە پێکهاتەیەك لە کاریگەری ڕۆحە پیسەکان و هەڵچوونی هێزە سروشتیەکەی لێی[3].

وە دەتوانرێت سیحر بەم جۆرە پێناسە بکرێت: گوزارشتە لە هەڵم و پێکهاتە و گرێ و کاروکردەوەگەلێك کە کەسی ساحیر بەکاری دەهێنێت لەدوای بێباوەڕبوونی بە خوا و پێی نزیك دەبێتەوە لە شەیتان و ئەو کارەش بە ئیزنی خوا کاردەکات لە کەسی سیحرلێکراو.

---

(١) الصحاح (٢/٦٧٩)، القاموس المحیط (ص٤٠٥).

(٢) أضواء البیان (٤/٤١).

(٣) زاد المعاد (٤/١١٥).

## مێژووی سیحر

هیچ ئوممەتێك نییە ئیللا خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانەکردوون کە بانگیان بکات بۆ یەکخواپەرستی و ڕێگریانیش لێ بکات لە هاوەڵ بۆ دانان، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴾ [فاطر:٢٤].

واتە: هیچ ئوممەتێك نییە لەئوممەتان ئیللا ترسێنەریان بۆ هاتووە دەیانترسێنێت لەسەرەنجامی بێباوەڕی و گومڕایەکەیان .

وە هەر ئوممەتێکیش کە پێغەمبەرەکەی بۆ هاتووە قەومەکەی گاڵتەیان پێکردووە و بە ساحیر ناوزەدیان کردووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ناسین و شارەزایی هەموو ئوممەتەکان بۆ سیحر هەر لە بوون و بڵاوبوونیانەوە لەسەر ڕووی زەویدا بە درێژایی چاخ و سەردەمەکان و هاتنی نەوە دوای نەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا۟ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴾ [الذاريات:٥٢]. واتە: هەروەك چۆن قوڕەیش باوەڕیان بە پەیامبەر موحەممەد ﷺ نەهێنا و بەدرۆیان دانا ، و ووتیان : شاعیرە یان جادووگەرە یان شێتە !!! بەهەمان شێوە ئوممەتانی پێشوش کە باوەڕیان بەپەیامبەرانیان نەکرد و بەدرۆیان دانان ، بۆیە خوای پەروەردگار سزایی خۆی بەسەردا دان .

ابن حەجەر بەڕەحمەت بێت دەڵێت: سیحر لە سەردەمی نوحدا هەبووە، بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای گەورە هەواڵ دەدات لەبارەی قەومی نوحەوە بەوەی بە

نوحیان وتووە ساحیر. هەروەها چیرۆکی هاروت و ماروت پێش سەردەمی نوح بووە سەلامی خوای لێ بێت وەکو ابن اسحاق و جگە لەویش گێڕاویانەتەوە[1].

دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی سیحر لای گەلێك زۆربووە و لای ئەوانی تر کەمتر بووە، ئەوەتا لەسەردەمی موسادا سەلامی خوای لێ بێت بەربڵاو بووە و تەنانەت ویستویانە بە سیحر ڕێگری لە موسا و پەیامەکەی بکەن.

ابن خەلدوون بەڕەحمەت بێت دەڵێت: سیحر لە بابل و میسردا لەسەردەمی موسادا سەلامی خوای لێ بێت بازاڕگەلێکی ڕەواجدراوی هەبووە[2].

(١) فتح الباري (٢٢٣/١٠).

(٢) تاريخ ابن خَلدون (٦٥٨/١).

## ئایا سیحر حەقیقەتە یان خەیاڵ؟

سیحر حەقیقەت و واقعی هەیە، جاری وا هەیە ئەوەندە کاریگەری دەکات دەبێتە هۆی جیابوونەوەی دوو هاوسەر - بەئیزنی خوا - وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ﴾ [البقرة:١٠٢]. واتە: جا خەڵك لە هەردووكیانەوە (هاروت و ماروت) فێری شتانێك دەبون ڕق وکینەی دەخستە نێوان ژن ومێردەوە تا جیابنەوە.

هەروەها کاریگەری هەیە لە ئازاردانی جەستە و هەتا لەناوبردنیشی بە نەخۆشی یان مردن، و جاری واش هەیە کاریگەری دەکاتە سەر لایەنی دەروونی سیحرلێکراو، هەموو ئەمانەش بە ئیزنی خوایە.

القرافی بەڕەحمەت بێت دەڵێت: سیحر حەقیقەتی هەیە، جاری وا هەیە کەسی سیحرلێکراو دەمرێت، یان سروشت و خو و عادەتی گۆڕانی بەسەردا دێت با ڕاستەوخۆ کاریشی لێ نەکات(١).

نەوەوی بەڕەحمەت بێت دەڵێت: صەحیح ئەوەیە کە سیحر حەقیقەتی هەیە وەکو پێشتر باسمان کرد، و زۆرینەی زانایانیش ئەم قسەیە دەکەن و ڕایان وایە و زانایان بەگشتی لەسەر ئەم بۆچوونەن و قورئان و سوننەتی صەحیحیش بەڵگەن لەسەری(٢).

(١) الفروق (١٤٩/٤).

(٢) روضة الطالبين (٣٤٦/٩).

ابن القيم بەڕەحمەت بێت دەڵێت: ئەم ئایەتە﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴾[الفلق:٤]، و فەرموودەکەی عائیشە[١] بەڵگەن لەسەر کاریگەری سیحر، و لەسەر ئەوەی کە سیحر حەقیقەتی هەیە[١].

---

(١) رواه البخاري، كتاب الطِّبِّ، باب السِّحر، رقم (٥٧٦٦)، ومسلم، كتاب السلام، باب السِّحر، رقم (٢١٨٩)، ولفظه: «سَحَرَ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَهُودِيٌّ مِنْ يَهُودِ بَنِي زُرَيْقٍ يُقَالُ لَهُ: لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ، قَالَتْ: حَتَّى كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَفْعَلُ الشَّيْءَ وَمَا يَفْعَلُهُ، حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ - أَوْ: ذَاتَ لَيْلَةٍ - دَعَا رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم، ثُمَّ دَعَا، ثُمَّ دَعَا. ثُمَّ قَالَ: يَا عَائِشَةُ، أَشَعَرْتِ أَنَّ اللَّهَ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ؟ جَاءَنِي رَجُلَانِ فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي وَالآخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ، فَقَالَ الَّذِي عِنْدَ رَأْسِي لِلَّذِي عِنْدَ رِجْلَيَّ - أَوِ: الَّذِي عِنْدَ رِجْلَيَّ لِلَّذِي عِنْدَ رَأْسِي - : مَا وَجَعُ الرَّجُلِ؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ، قَالَ: مَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ، قَالَ: فِي أَيِّ شَيْءٍ؟ قَالَ: فِي مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ، قَالَ: وَجُفِّ طَلْعَةِ ذَكَرٍ، قَالَ: فَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ: فِي بِئْرِ ذِي أَرْوَانَ.
قَالَتْ: فَأَتَاهَا رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فِي أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا عَائِشَةُ، وَاللَّهِ لَكَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الحِنَّاءِ، وَلَكَأَنَّ نَخْلَهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ.
قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلَا أَحْرَقْتَهُ؟ قَالَ: لَا، أَمَّا أَنَا فَقَدْ عَافَانِي اللَّهُ، وَكَرِهْتُ أَنْ أُثِيرَ عَلَى النَّاسِ شَرًّا، فَأَمَرْتُ بِهَا فَدُفِنَتْ».واتە: عائیشە (رضي الله عنها) دەڵێ: جولەکەیەك لە جولەکەکانی (بنی زریق)کە پێی دەوترا (لەبیدی کوڕی ئەعصەم) جادوی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) هەتا پێغەمبەر (ﷺ) وادەهات بە خەیاڵیدا کە شتێکی کردووە نەیشی کردبوو، هەتا ڕۆژێك یان شەوێك- پێغەمبەر (ﷺ) پاڕایەوە، هەر پاڕایەوە هەر پاڕایەوە، پاش ئەوە فەرمووی: ((ئەی عائیشە ئایا هەستت کرد خوا ئاگاداری کردم لەو شتەی داوام لێکرد ئاگادارم کات؟ دو پیاو هاتن بۆ لام یەکێکیان لای سەرم و ئەوی تریان لای قاچم دانیشت، ئەمەی لای سەرم بەوەی لای قاچم یان ئەوەی لای قاچم بەوەی لای سەرمی وت : ئازاری ئەم پیاوە چی یە؟ وتی: جادوی لێ کراوە، وتی: کێ جادوی لێکردووە؟ وتی: (لبید)ی کوڕی (أعصم) وتی: لە چ شتێکدا؟ وتی: لەشانەیەك و چەند تاڵێك موو کەبەدەم شانە کردنی سەر، یان ڕیشەوە دەکەونە خوارەوە لە ناو قاوغی گوڵی دارخورمایەکی نێردا، وتی: وا لەکوێدا؟ وتی: وا لەناو بیری (ذي أروان)دا)). عائیشە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵانیدا چوو بۆ لای ئەو بیرە، لەپاشدا فەرمووی: ((ئەی عائیشە واللە ئاوی ئەو بیرە وەك=

## مەترسی سیحر

بەنرخترین شتێك كە موسڵمان هەیەتی لەم ژیان و دونیایەدا دینەكەیەتی، جا كەسی ژیر ئەوەیە كە پارێزگاری لە دینەكەی دەكات و ڕازی نابێت تانەی لێ بدرێت و كەم بێتەوە و كەسێك بیروباوەڕی لەكەدار بكات و كاریگەری نەرێنی لەسەر بكات.

جا سیحر و ڕۆیشتن بۆلای ساحیران بۆ ئەنجامدانی سیحر مەترسیەكی گەورەی هەیە لەسەر بیروباوەڕ، چونكە ئەو كارە یەكێكە لە هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام، ئەوەتا شێخ موحەممەدی كوڕی عبدالوهاب بەڕەحمەت بێت دەڵێت: حەوتەم - حەوتەم دانە لە هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام - بریتیە لە سیحر، لەوانە جۆری الصَّرْفُ وَالعَطْفُ[٢]، جا هەركەس ئەنجامی بدات یان پێی ڕازی بێت، ئەوا كوفری كردووە، بەڵگەش لەسەر ئەمە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا

---

=خەنەی تێكرابێ وەهابوو دارخورماكانیشی وەك سەری شەیتانەكان بوون)) عائیشە دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نەتسوتاند؟! فەرمووی: ((نەخێر، چونكە من خوا شیفای دام، پێیشم ناخۆش بوو شەڕ بئاڵۆزێنم بۆ خەڵكی، فەرمانم دا لەبیرەكە دەریان هێنا و خستیانە ژێر گڵەوە)).

(١) بدائع الفوائد (٢/٢٢٧).

(٢) الصَّرْف: جۆرە سیحرێكە مەبەست لێی گۆڕینی مرۆڤە لەو شتەی حەزی لێیەتی, وەكو لادان و گۆڕینی پیاو لە خۆشویستنی هاوسەرەكەی بۆ ڕق لێبوونی.

والعَطْف: جۆرە سیحرێكە مەبەست لێی ئەوەیە وا لە مرۆڤ دەكات حەزی بچێتە سەر ئەو شت یان كەسەی كە حەزی پێی نییە, ئەوەش بە چەند ڕێگەیەكی شەیتانی.

العقیدة الصَّحیحة لابن باز (ص٣٧-٣٨).

يُعَلِّمَانِ مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا تَكۡفُرۡ ﴾ [البقرة:١٠٢]»[١]. واتە: ئەو دوو فریشتە هیچیان فێری هیچ کەسێك نەدەکرد تاکو ئامۆژگاریان نەکردایە و ئاگاداریان نەکردنایە لە فێربونی جادوو ، و پێیان دەوت : کوفر مەکە بە فێربونی جادو و گوێرایەڵیکردنی شەیتانەکان.

جا ساحیر و ئەوەی دەڕوات بۆ لایشی بۆ سیحر حوکمەکەیان وەکو یەکە و هاوتای یەکترن.

وە هەرکەس سیحر بکات ئەوا شیرکی ئەنجام داوە، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «وَمَنْ سَحَرَ؛ فَقَدْ أَشْرَكَ» رواهُ النَّسائيُّ[٢]،واتە: هەرکەس سیحر بکات ئەوا شیرکی کردووە.

شێخ عبدالرحمن ی کوڕی حەسەن بەڕەحمەت بێت دەڵێت: ئەمە دەقێکی ڕاشکاوە لەسەر ئەوەی کە ساحیر موشریکە[٣].

هەروەها سیحر لە هەموو دینی پێغەمبەراندا حەرام بووە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ﴾[طه:٦٩] واتە: جادوگەر بەجادوکردنەکەی سەرکەوتوو نابێت لەهەر کوێیەکدا بێت .

(١) نواقض الإسلام - ضمن المستوى الأوَّل من متون طالب العلم - بتحقيقنا (ص٢٧).
(٢) كتاب تحريم الدَّم، الحُكم في السَّحَرة، رقم (٤٠٧٩)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.
(٣) فتح المجيد (ص٢٩١).

سیحر یەکێکە لە لەناوبەرەکانی دین، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:

«اجْتَنِبُوا السَّبْعَ المُوبِقَات، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّه، وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: الشِّرْكُ بِاللَّه، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ اليَتِيم، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ المُحْصَنَاتِ المُؤْمِنَاتِ الغَافِلَاتِ» متَّفقٌ عليه[(١)].

واتە: دووربکەونەوە لەوحەوت گوناهەی کەئادەمیزاد تیادەبەن)) وتیان: ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: ((هاوەڵ بۆ خوا بریاردان، جادوو، کوشتنی ئادەمیزاد کەخوا حەرامی کردووە، مەگەر بەهەقی خۆی، سوو خواردن، خواردنیماڵی هەتیوو، پشت هەڵکردن لەرۆژی جەنگی کافراندا، بوختان کردن بۆ ئافرەتانی باوەڕداری بێ ئاگای پاکداوێن.

وە سیحر هەموو ئەو تاوانە لەناوبەرانە کۆدەکاتەوە کە دینی مرۆڤ تیادەبەن، هەر لە پەنابردن و داواکردنی فریاکەوتن لە جن وشەیتان و هەڵواسینی تەڵەسم و ملوانکە و دڵپەیوەست کردن و ترسان لە غەیری خوا و پشت نەبەستن بە خوا و تێکدانی گوزەران و ژیانی خەڵکی و پێچەوانەکردنی دەقە شەرعیەکان.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾[الأعراف:٥٦]. واتە: خراپەکاری لەسەر زەویدا مەنێنەوە بەهەر جۆرێك لە جۆرەکانی خراپەکاری ، پاش ئەوەی کە خوای

---

(١) رواه البخاري، كتاب الحدود، باب رَمْي المُحصَنات، رقم (٦٨٥٧)، ومسلم، كتاب الإيمان، باب بيان الكبائر وأكبرها، رقم (٨٩)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

پەروەردگار چاککاری تێدا کردووە بەناردنی پەیامبەرانی ـ سەلامی خوایان لەسەر بێت ـ و ئاوەدانی کردوەتەوە بەگوێڕایەڵی پەروەردگار ، وە هاوار لە پەروەردگار بکەن بەئیخڵاصەوە لە ترسی سزای و بەئومێدی پاداشتی ، بێگومان ڕەحمەتی خوا لە چاکەکارانەوە نزیکە .

* * *

## ساحیر دینەکەی فرۆشتوە

ساحیر خۆی و دینەکەی بە شەیتان فرۆشتووە، جا شەیتانیش بە کەمتر لەوە ڕازی نابێت کە ئەو کەسە ببێتە کۆیلەی و بەندایەتی بۆ بکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ﴾ [البقرة:١٠٢]. واتە: بێگومان جولەکە باش دەیانزانی کە هەرکەس جادوکردن هەڵبژێرێ و واز لە هەق بهێنێت ئەوا لە دوارۆژدا لە چاکە هیچ بەشێکی نیە.

وە ساحیر ناتوانێت لە سیحرەکەیدا سەرکەوتوو و شارەزا بێت هەتا لەم دینە دەرنەچێت، ئیتر یان بە سەربڕین بێت بۆ جن یان داوای فریاکەوتن کردن لێیان وپەنابۆبردنیان یان سووکایەتی کردن بە فەرمایشتی خوا یاخود هەر شتێکی تر لە تاوانە لەناوبەرەکان.

شێخی ئیسلام دەڵێت: ساحیرەکان قورئان بە پیسایی دەنووسنەوە و پیتەکانیشی هەڵدەگێڕنەوە، ئیتر پیتەکانی سورەتی فاتیحە بێت یان ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ [الإخلاص:١]، یان جگە لەو دووانە، یاخود بە خوێن دەینوسنەوە یان شتی تر، بەبێ پیسایی ئیتر هەر شتێك بێت کە شەیتانەکان پێی ڕازی ببن یان قسە بەوە دەکەن[١].

(١) مجموع فتاوى شيخ الإسلام (٣٥/١٩).

جا هەرکەس خۆی بەشەیتان بفرۆشێت ئەوا دەستبەرداری ڕەوشت و ئاکاری جوان و بەرز دەبێت و دڵکوێر و گومڕا دەبێت، هەمیشە لە هەوڵی خراپەدایە و ڕوو لە تاوان و پشت لە چاکە و خێر دەبێت، دژ بە دین و گاڵتەپێکەری دەبێت، بێزراو دەبێت لای کەسوکاری و ڕق ئەستوور دەبێت لە کۆمەڵگاکەی، و لەپێناو ڕازی کردنی نەفسی پیسیدا و ئارەزووە چەپەڵەکانیدا چەندین ڕێگا و شێواز و مامەڵەی شێتانە و قیزەون و شیرك دەکات.

شێخی ئیسلام دەڵێت: کۆتا کاری سیحرەکەیان بریتیە لە گومان دروست کردن لە بارەی خوای پەروەردگارەوە و تاغوت و شەیتان پەرستی، و مامەڵەکردن بە زێڕی ساختەوە وفەساد و خراپە نانەوە لەسەر زەویدا و لەگەڵ ئەوەشدا کەمێکیان بەو ئامانجە دەگەن کە دەیانەوێت بەڵام بە دوورکەوتنەوە لە خواوە، و زۆربەیان بێبەش و تاوانبارن و ئاواتەخوازی کوفر و فسوق وگوناه وسەرپێچین، گوێبیستی شەڕ و درۆن و حەرامخۆرن و زەلیلی درۆ و تاوانیان پێوە دیارە[1].

خوای گەورە ئادەمی لە قوڕ دروست کردووە و جنیشی لە ئاگر بەدی هێناوە، وەکو دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ۝ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَـٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ﴾[الحجر:٢٦-٢٧]. واتە: دڵنیابن لەوەی کە ئێمە ئادەممان لە قوڕێکی و شکهەڵاتوو دروستکردووە کە ئەگەر پێیدا بکێشرایە و لێبدرایە دەنگی

(١) درء تعارض العقل والنَّقل (٥/٦٣).

لێوە دەبیسترا ، وە ئەم قورە وشکهەڵاتووەش لە قوڕێکی ڕەشی گۆڕاو ـــ لە ڕەنگ و بۆندا ـــ وەرگیراوە . وە ئێمە لە پێیش دروستکردنی ئادەم ئیبلیسی باوکی هەموو جنۆکەکانمان لە ئاگرێکی بە تینی بێدوکەڵ دروستکردووە .

فەزڵی ئادەمیزادی داوە بەسەر جندا و دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّمَّنۡ خَلَقۡنَا تَفۡضِيلٗا ﴾ [الإسراء:٧٠]. واتە: بێگومان ڕێزمان لەنەوەکانی ئادەم ناوە بەپێبەخشینی عەقڵ و ناردنی پەیامبەران ، وهەموو ئەوەش کە لەبونەوەردایە بۆمان تەسخیر کردوون ، لەوانەش ئاژەڵەکان لەوشکانی و کەشتیش لەدەریاکاندا بۆهەڵگرتنیان ، ورزق و ڕۆزی چاکمان داون لەخواردن و خواردنەوەکان ، وزۆر بەڕێزترشیمان کردوون بەسەر زۆرێك لەدروستکراوەکانی تردا .

ساحیر ڕازی نابێت ئیلا بە زەلیل کردنی خۆی نەبێت بۆ ئەوەی لە خوار خۆیەوەتی، شێخی ئیسلام دەڵێت: جنۆکەکان دەزانن کە ئادەمیزاد لەوان بەڕێزتر و شکۆدارترن، جا بۆیە هەرکات مرۆڤ ملکەچیان بوو و پەنای بۆ بردن، ئەوا وەکو ئەوە وایە کە کەسانی گەورە وبەڕێز ملکەچی کەسانی بێ دەسەڵات و کەم ڕێز ببن بۆ ئەوەی پێویستیەکانیان بۆ پڕبکەنەوە(١) .

---

(١) مجموع فتاوى شيخ الإسلام (٣٤/١٩).

## بۆچی شەیتانەکان خزمەتی ساحیران دەکەن؟

شەیتان دوژمنی مرۆڤە، بەشێوەیەك کەلەسەر ڕێگای ڕاست بۆی دادەنیشێت ولەبۆسەدایە بۆی و لەهەموو شوێن و بەهەموو ئاڕاستەیەکەوە بۆی دێت تەنها بۆ ئەوەی وا لە مرۆڤ بکات جگە لە خوا بپەرستن، ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ * إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴾ [ص:٨٢-٨٣]. واتە: ئیبلیس ووتی : سوێند بە عیززەت و گەورەیی تۆ ئەی پەروەردگار دەبێت هەموو ئادەمیزاد گومڕا و سەرلێشێواو بکەم ، جگە لەوانە نەبێت کە تایبەتت کردوون بۆ خواپەرستی خۆت ، و پاراستوونت لە گومڕاکردنەکەی من ـ واتە : عیصمەتت پێداوون ـ ، و دەسەڵاتت پێ نەداوم بەسەریاندا .

سیحر بەجێ نایەت و دەستی ساحیر ناکەوێت ئیلا بە شەیتانپەرستی و دەرچوون لە ئیسلام نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ﴾ [البقرة:١٠٢]. واتە: ئەو دوو فریشتە هیچیان فێری هیچ کەسێك نەدەکرد تاکو ئامۆژگاریان نەکردایە و ئاگاداریان نەکردنایە لە فێربونی جادوو ، و پێیان دەوت : کوفر مەکە بە فێربونی جادو و گوێڕایەڵیکردنی شەیتانەکان.

جا هەرکات بەندە لە دین دەرچوو ئەوا شەیتان بردویەتیە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئەمەش مەبەستێتی لە لاڕێکردنی ئادەمیزادا.

شێخی ئیسلام دەڵێت: مەبەست و ئامانجی شەیتان ئەوەیە کە مرۆڤ شەیتان بپەرستێت و نوێژ و ڕۆژووی بۆ بگرێت و قوربانی بۆ بکات تەنها لەپێناو ئەوەی پشکێکی دونیایی دەست بکەوێت، جا خراپەی گەورەترە لە چاکیەتیەکەی و تاوانەکەشی گەورەترە لە سوود وبەرژەوەندیەکەی[1].

شەیتان خزمەتی ساحیر دەکات لەپێناو ئەزیەت و ئازاردانی بەندەکانی خوا و جیاکردنەوەی هاوسەران لەیەکتری و مایەپوچ کردنیان و تێکدانی ژیان و گوزەرانیان وزیان و زەرەر پێگەیاندنیان و نانەوەی ئاژاوە و پەرتەوازەکردنیان و ناکۆك کردنیان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ﴾ [البقرة:١٠٢]. واتە: جا خەڵك لە هەردووکیانەوە (هاروت و ماروت) فێری شتانێك دەبون ڕق وکینەی دەخستە نێوان ژن ومێردەوە تا جیابنەوە.

خزمەتی دەکات بۆ ئەوەی بەندەکان لە یەکخواپەرستی لابدات وپەیوەستیان بکات بە شەیتان و ساحیران و فاڵچیان و جادووگەرانەوە.

(١) درء تعارض العقل والنَّقل (٦٥/٥).

## فێڵی ساحیر

ساحیران خزمەتکاری شەیتانەکانن، شەیتانیش داوا لەوانە دەکات کە دەیپەرستن و کەوتونەتە داویەوە کە بەندەکانی خوا لاڕێ بکەن و لەڕێ دەریان بکەن و سەرلێ شێواویان بکەن، و ساحیریش داوا لەو کەسە دەکات کە دێت بۆ لای بەوەی قوربانی بۆ غەیری خوا بکات.

هەندێ جاریش فەرمانی پێ دەکات بەهەڵواسینی نوشتەی شیرکی بەجەستەیەوە یان لەژێر سەرینەکەی لەکاتی خەوتنیدا، بەمەش ساحیر ئەو کەسەی دێت بۆ لای تووشی شیرکی دەکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ عَلَّقَ تَمِيمَةً؛ فَقَدْ أَشْرَكَ» رواهُ أحمدُ[(١)]

واتە: هەرکەس تەمیمە (نوشتە) هەڵبواسێت ئەوا شیرکی کردووە.

جا ئەمەش جۆرێکە لە فێڵەکانیان بۆ ئەوەی خەڵکی تووشی شیرك بکەن.

هەروەها لە فێڵی ساحیران: وا سەردانیکارانیان تێ دەگەیەنن کە نەخۆشیەکانیان دەزانن، کە لەڕاستیدا ناوی ئەو نەخۆشیانەیان پێ دەڵێن کە هیچ کەس لێیان دەرباز نابێت و زۆرێك تووشی دەبن، بۆ نمونە دەڵێن: جارجارە سەرئێشەت تووش دەبێت، یان پشت ئێشە، یاخود خەم و پەژارەیەکت هەیە ناوبەناو، یان تووشی کێشەیەك دەبیت و لێی دەردەچیت، یان کارێکت بۆ دەستەبەر دەبێت کە خۆشحاڵت دەکات، ئیتر هاوشێوەی ئەم جۆرە گوزارشتانە

(١) في المسند، رقم (١٧٤٢٢)، من حديث عُقْبة بن عامر الجُهنيِّ رضي الله عنه.

کە تووشی هەموو تاکێك دەبێت، جا مەبەستیشیان لەمەدا ئەوەیە کە سەردانیکارانیان پەیوەست بن پێیانەوە و دەستیان لێ هەڵنەگرن.

هەروەها لە فێڵی ساحیران: لەسەر پارچە کاغەزێکی سیحراوی چەند ئایەتێك لە قورئان دەنووسن، ئەوەش بۆ خۆڵکردنە چاوی خەڵکی بۆ ئەوەی وا پیشان بدەن کە ئەوان پەنا بۆ جن نابەن و داوای هاوکاری لەوان ناکەن و بەڵکو تەنها ناوی خوا دەهێنن و داوای بەهاناوە چوون و هاوکاری هەرلەو دەکەن، ئەم فێڵەش بۆ چاوبەستی کەسانی ساویلکە وسادەیە.

## نیشانەكانی ساحیر

هەموو ساحیرێك كۆمەڵە نیشانەیەك بۆ خۆی دادەنێت، بۆ ئەوەی كەسانی گەمژە و تێنەگەیشتووی پێ فریوو بدەن، جا لەو نیشانانەی كە زۆرێك لە ساحیران كۆكن لەسەری و بۆخۆیانیان داناوە، ئەمانەی خوارەوەیە:

١ - پرسیاری ناو و ناوی دایك و تەمەنی ئەو كەسە دەكات كە دێت بۆ لای، ئەمەش دیارترین نیشانەی ساحیرە ئەوەش لەبەر ئەوەی مامەڵە لەگەڵ شەیتانەكاندا دەكات.

٢ - داوای شتێك دەكات هی ئەو كەسە بێت كە دەیەوێت سیحری لێ بكات، وەكو جلی ژێرەوە یان كۆمەڵە موویەك یان نینۆك.

٣ - داوای وێنەی ئەو كەسەی دەیەوێت سیحری لێ بكات، جا بۆیە وێنەی خۆت مەدە بە هیچ كەس چونكە ئەوان كە دەستیان بكەوێت بۆ مەبەستی سیحرلێكردنت بەكاری دەهێنن.

ئەمەش لەڕاستیدا یەكێكە لە حیكمەتەكانی حەرامێتی وێنەگرتن، و بەرهەمی دەستگرتنە بە شەرعەوە لە وێنەنەگرتندا، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:

«لَعَنَ اللَّهُ الْمُصَوِّرَ» رواهُ البخاريُّ[1] واتە: خوا نەفرەتی كردووە لە وێنەكێش.

(١) كتاب البيوع، باب ثمن الكلب، رقم (٢٢٣٨)، من حديث أبي جُحَيْفَة رضي الله عنه.

جا بۆیە هیچ وێنەیەکی خۆت یان خێزانت یان منداڵت بەبێ پێویستی مەهێڵەوە نەوەك بکەویتە ناو ئەو هەڕەشەیەوە و بتگرێتەوە کە هاتووە لەسەر وێنە، لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «كُلُّ مُصَوِّرٍ فِي النَّارِ» متَّفقٌ عليه[(١)]؛ واتە: هەموو وێنەکێشێك لەناو ئاگردایە. ئەمەش بۆ ئەوەی دووربکەویتەوە و پارێزراو بیت لە فیتنە و ئاشووبی ساحیران و درۆزنان.

٤ - بەکارهێنانی بخورِ و بۆنی هاوشێوە و دانانی لەنێو بۆنداندا، چونکە بەو کارە شەیتانەکان دەهێنن بۆ لایان و کاریان پێ دەکەن.

٥ - کارکردنیان بەکاتی شەوان، ئەمەش زۆربەی کاتی کار وچالاکیەکانیانە، ابن القيم بەڕەحمەت بێت دەڵێت: دەسەڵات و کاریگەری گەورەی سیحر بە شەوانە نەوەك ڕۆژ، بۆیە سیحری شەوان بەلایانەوە کاریگەری بەهێزترە[(٢)] جا ئەگەر سیحرەکە بە شەو نەبوو ئەو ساحیرە پەنا دەباتە بەر شوێنێکی تاریك بۆ ئەنجامدانی سیحرەکە.

٦ - بەکارهێنانی وشەگەلێکی ناڕوون لە نوشتە و جوڵەی لێو کە قورسە ئەو کەسەی دەیبیستێت تێی بگات.

---

(١) رواه البخاري، كتاب البيوع، باب بيع التَّصاوير الَّتي ليس فيها روح، وما يُكرَه من ذلك، رقم (٢٢٢٥)، ومسلم، كتاب اللِّباس والزِّينة، باب لا تدخل الملائكة بيتاً فيه كلب ولا صورة، رقم (٢١١٠)، من حديث ابن عبَّاسٍ رضي الله عنهما.

(٢) بدائع الفوائد (٢/٢١٩).

٧ - تێکەڵکردنی ئایەتی قورئان و فەرموودە لەناو نوشتەکەدا لەکاتی چارەسەردا، بۆ ئەوەی خەڵکی فریو بدات بەوەی گوایا ئەو ساحیر نییە و تەنها قورئان بەکاردەهێنێت.

٨ - داواکردنی ئاژەڵێك بە نیشانە و سیفاتی دیاریکراو.

٩ - بەکارهێنانی پەرتووکی ساحیران کە هێما و نەخشەی تێدایە کە زۆرجار لەتەنیشتی خۆیەوەیە ئەگەرهاتوو دڵنیابوو لە نەخۆشەکە.

١٠ - نووسینی تەڵەسم وهێما وپیتی پچڕپچڕ وژمارە وچوارگۆشە وبازنە و جووت هێڵی درێژ.

١١ - پێدانی پارچەیەك بەنەخۆشەکە کە لە شێوەی سێگۆشە یان چوارگۆشەی پێچراودایە لە پێست یان پارچە ئاسن یان مس، و لەناویدا پەنا بۆبردن و داوای فریاکەوتنی شیرکی تێدایە لەگەڵ کۆمەڵە ژمارە وپیتێك، کە ساحیرەکە فەرمانی پێ دەکات بەوەی هەڵی بواسێت بەملیدا یان بەقۆڵیدا یاخود بیخاتە ژێر سەرینەکەیەوە و هانی دەدات بەوەی پشتگوێی نەخات و نەخۆشەکە یان ئەوەی لەگەڵیدایە دەترسێنێت بەوەی ئەگەر فڕێی بدات یان پشتگوێی بخات.

١٢ - پێدانی چەند پەڕەیەك بەنەخۆش کە تەڵەسمی تێدایە بەوەی بیسووتێنێت و هەڵم و دووکەڵی لێ دروست بکات.

١٣ - پێدانی چەند پەڕەیەك بە نەخۆش کە تەڵەسم و پیتی پچڕپچڕ و نەخشە و ژمارەی تێدایە کە فەرمانی پێ دەکات بەوەی بیکات بەناو ئاودا و پاشان بیخواتەوە یاخود خۆی پێ بشۆریت.

جا ئەمانە هەندێکن لە نیشانەکانی ساحیران، و بەهەمان شێوە لەم نیشانانەدا کەسانی فاڵچی و جادووگەریش بەشدارن، جا ئەگەر شتێك لەمانەت بۆ ئاشکرا بوو لای یەکێکیان ئەوا وریابە و ئاگاداری تێکدانی بیروباوەڕت بە ولێی دووربکەوەرەوە و دەستبەجێ وازی لێ بهێنە چونکە هەرکەسێك واز لەشتێك بهێنێت لەبەرخوا ئەوا خوای گەورە بۆی قەرەبوو دەکاتەوە بە لەوە باشتر وچاکتر.

## ئافرەتان و ساحیران

کەسی ژیر خۆی دەگرێتەوە لەوەی بڕوات بۆ لای کەسانی درۆزن، لەنێو ئافرەتانیشدا هەیە کە زوو سکاڵا و نارەزایەتی دەردەبڕێت لە قەزاوقەدەر ئەگەر هاتوو ئەوەی لەدڵیایەتی بۆی بەجێ نەیەت، جا بۆیە هەوڵ دەدات بەدەستی بهێنێت تەنانەت ئەگەر بەڕێگەی ناشەرعی و تورەبوونی خواش بوویێت، بۆ ئەو مەبەستە دەڕواتە لای ساحیر و ئەویش فریوی دەدات و جاری واش هەیە دەست بۆ ناموسیشی دەبات و فەرمانیشی پێ دەکات کە سەردانی بکاتەوە بۆ ئەوەی ئامانجەکەی بۆ بەدی بهێنێت، جا ئەمیش سیحری لێ دەکات و ماڵ وپارەکەشی دەبات و ناموسیشی لەکەدار دەکات.

پێشەوا قورتوبی بەڕەحمەت بێت دەڵێت: زۆربەی ئەو کەسانەی کە سیحر دەکەن لە ئافرەتانن بەتایبەت لەکاتی حەیزیاندا.[1] وە زۆربەی سووتەمەنی دۆزەخیش ئافرەتانن. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «أُرِيتُ النَّارَ فَإِذَا أَكْثَرُ أَهْلِهَا النِّسَاءُ» متَّفقٌ عليه[2].واتە: دۆزەخم پیشان درا وبینیم زۆربەی ئەهلەکەی ئافرەتانن.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن (٢/٥٠).

(٢) رواه البخاري، كتاب الإيمان، باب كفران العَشِير، وكفْر دون كفْر، رقم (٢٩)، ومسلم، كتاب الكسوف، باب ما عرض على النَّبيِّ صلى الله عليه وسلم في صلاة الكسوف من أمْر الجنَّة والنَّار، رقم (٩٠٧)، من حديث ابن عبَّاسٍ رضي الله عنهما.

جا ئافرەتان پێویستە لە خوابترسن و تەقوای خوایان هەبێت، چونکە ئەوە هێنەری خۆشبەختی و بەختەوەریە، ئەوەتا خوای میهرەبان دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا * وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ﴾ [الطلاق:٢-٣]. واتە: دەبا هەرکەس لەخوا دەترسێت کار بەوە بکات کە فەرمانی پێکردووە و بەدوور بێت لەوەی کە یاساغی لێکردوە ، لە پاداشتدا خوای پەروەردگار لە هەموو ناخۆشیەك دەرگای دەربازبوونی بۆ دەکاتەوە ، وە ڕێگاکانی بەدەست هێنانی ڕزق و ڕۆزی بۆ ئاسان دەکات لە شوێنێکەوە کە هەرگیز بە بیر و خەیاڵیدا نایەت.

جا ئەوەی لەسەریانە ئەوەیە کە ڕازی و قایل بن بەو قەدەرەی دێتە ڕێگایان و تووشیان دەبێت ولەسەریان نووسراوە، و دینەکەیان نەفرۆشن بە حەز و ئارەزوو وئومێدی بەتاڵ لای کەسانی دوور لەدین و خراپەکار، و ئەگەریش حەز و ئامانجێك لەدڵ و ناخیاندا هەیە ئەوا با پەنا بۆ خوای باڵادەست ببەن و لەو داوا بکەن ودوعا وپاڕانەوەیان تەنها بۆ لای ئەو بێت، چونکە تەنها ئەو لەدەسەڵاتیدایە کە سوود و قازانج بگەیەنێت و زەرەر و زیانیش دووربخاتەوە، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يُرِدۡكَ بِخَيۡرٖ فَلَا رَآدَّ لِفَضۡلِهِۦۚ﴾ [یونس:١٠٧]. واتە: ئەگەر خوای پەروەردگار تووشی ناڕەحەتی و تاقیکردنەوەیەکی کردی ـ ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ـ ئەوا هیچ لابەرێکی بۆ نیە جگە لە خوای شکۆدار و پایەبەرز نەبێت ، وە ئەگەر ویستی خۆشگوزەرانی و ناز و نیعمەتی زۆری پێکردیت ، دیسان هیچ کەس و شتێك توانای ڕێگریکردنی نیە.

## ستەمی ساحیر

کەسی ساحیر بەهۆی ئەنجامدانی سیحرەکەیەوە چەندین گوناه و سەرپێچی و دەستدرێژی و ستەمی لێ دەوەشێتەوە و دەیکات، چەندین کەس هەن کە ساحیر تووشی شیرکی کردوون بەهۆی ئەوەی فەرمانی پێ کردووە بەوەی ئاژەڵێك بۆ غەیری خوا سەرببڕێت، یان نووشتەیەك بەخۆیدا هەڵبواسێت، یاخود بڕوا بە هەواڵێکی غەیبی بکات کە تەنها خوا نەبێت کەس نایزانێت.

هەندێ لە ساحیران تەنانەت ئەوانەی زۆر دێن بۆ لایان بەتایبەت لە ئافرەتان تووشی داوێن پیسی و زینایان دەکەن.

بۆیە کەسی ساحیر زۆرێك لە ماڵ و خانەوادە بەختەوەرەکانی تێك داوە، چەندین ژن ومێردی خۆشەویستی یەکتری لەیەکتر کردۆتەوە و جیای کردوونەتەوە، و بەوهۆیەشەوە منداڵەکانیان لاڕێ بوون و چێژیان لەژیانی خۆیان نەبینی وبەڵکو ڕوبەڕووی گوزەرانێکی تاڵ وسەخت بوونەوە.

ساحیر چەند غەم و پەژارەی تووشی خەڵکی کردووە؟ چەند کەسی تەندروست وساغی تووشی نەخۆشی کردووە؟ چەند خێزانی ئاسوودەی تێکداوە؟ چەند هەژاری تووشی باری قورسی قەرزاری کردووە وبەدوای چارەسەری نەخۆشیەکەیدا وێڵە و هەڵوەدای سەلامەتی و لەشساغیە ؟

ساحیر چەند ستەمی لەخەڵکی کردووە بە خواردنی پارە وسامانیان بەناڕەوا وبەناوی چارەسەر یان پێوتنی هەواڵی غەیبــی؟

ساحیر لەڕاستیدا زۆر ڕق لەدڵە بەرانبەر بە کۆمەڵگە و ئاسوودە نییە و پشوونادات تەنها بە تێکدانی نەبێت، خۆشحاڵ نابێت بە دڵخۆشی خەڵکی و دڵشاد نابێت بە دەوڵەمەندی خواپێداوان، و پایەبەرزی کەسانی ڕێزدار و ماقووڵی کۆمەڵگە.

ساحیر تەنها زەرەر و زیانی هەیە بۆ کۆمەڵگە و هیچی تر، بەشێوەیەك کە بەهیچ کلۆجێك تروسکایی خێری تێدا نییە، ئایا کەس بینیویەتی لە ساحیر کە خێر و خۆشی بڵاوبکاتەوە و یارمەتی هەژاران بدات ودەستەبەری هەتیوان بکات و چاودێری وسەرپەرشتی بێوەژنان بکات؟ نەك هەر ئەوە بەڵکو هەوڵ و ماندوبونی بۆ تێکدانی تاك و خێزان و دواتریش کۆمەڵگەیە هەم لە دونیادا بەنانەوەی کێشە و دروستکردنی خەم وپەژارە و دڵتەنگی و هەمیش بۆ قیامەت بەوەی تووشی شیرك و گومڕاییان دەکات.

## حەقیقەتی ساحیر

ساحیر خاوەنی پیسترین ناخە و خوارترین سروشتی هەیە و قێزەونترین کار وپیشەی هەیە و تاریکترین دڵی هەیە، پێشەوا ابن القیم بەڕەحمەت بێت دەڵێت: ساحیر لەگەڵ نەفسە پیسەکاندا نەبێت کار ناکات ئەوانەی کە گونجا و هاوشێوەی ئەو ڕۆحە چەپەڵانەن[1]، هەروەها دەڵێت: دڵە تاریکەکان شوێن و سەرچاوەی شەیتانەکانن[2].

ساحیر گەمژەترینی نێو خەڵکیە و کەمترین ژیری هەیە و خراپترین بیرکردنەوەی هەیە و پشکی دونیای پێش ئاخیرەت خستووە لە پێناو دەستکەوتنی پاروویەکی ژیان و گوزەراندا، و دەستی داوەتە کار و پیشەیەك کە دەشزانێت ئاکامەکەی بۆ ئاگرە.

پێشەوا ابن القیم بەڕەحمەت بێت دەڵێت: بەدەگمەن سیحر ئەنجام دەدرێت بەبێ جۆرێك لە شەیتان پەرستی و نزیك بوونەوە لێی، ئیتر بەسەربڕین بێت بەناوی ئەوەوە، یان سەربڕین بۆ خودی ئەو، ئەوکات دەبێتە سەربڕین بۆ غەیری خوا وبەچەندین شێوە و جۆری تر لە جۆرەکانی شیرك وفسوق[3].

(١) إعلام الموقعين (٢٩٨/٥).

(٢) بدائع الفوائد (٢١٩/٢).

(٣) بدائع الفوائد (٢٣٥/٢).

ساحیر لە شەیتانەوە نزیکە و لەو دەچێت لەڕووی زیان گەیاندنی بەخەڵکی، پێشەوا ئالوسی بەڕەحمەت بێت دەڵێت: شەیتانەکان هاوکاری هیچ کەسێك ناکەن تەنها ئەوانە نەبێت کە لە خۆیان دەچن لە پیسی و چەپەڵیدا لەڕووی گوفتار و کردار و بیروباوەڕەوە[1] .

ساحیر وەسف دەکرێت بە وەسفی بێ ڕێزترینی خەڵکی، کە وەسفی درۆکردنە، چونکە درۆ دەکات بۆ سەردانیکارانی و هەواڵی ناڕاستیان بەگوێدا دەدات، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «فَيَكْذِبُونَ مَعَهَا مِئَةَ كَذْبَةٍ» متَّفقٌ عليه[2] .واتە: لەگەڵ ئەو قسەیەدا سەد درۆی لەگەڵدا دەکەن.

ساحیر بەهۆی خۆبەگەورەزانینەکەیەوە خۆی بەبەرزتر دەزانێت لەخەڵکی، و ئەوەش خودی ئەو سیفەتەیە کە ئیبلیسی لەبەهەشت دەرکرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِلَّآ إِبۡلِيسَ ٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ [ص:٧٤]. واتە: هەموو فریشتەکان پێکەوە ـ وەکو گوێڕایەڵیەك بۆ خوا جگە لە ئیبلیس نەبێت ـ سوجدەیان بۆ برد ، چونکە ئەو وەکو خۆبەگەورە زانێك و لوتبەرزیەك سوجدەی بۆ نەبرد ، وە ئەو ـ لەزانستی پێشوەختی خودادا ـ لە بێباوەڕان بوو .

---

(١) روح المعاني (٣٣٧/١).

(٢) رواه البخاري، كتاب بدء الخلق، باب ذِكر الملائكة، رقم (٣٢١٠)، ومسلم، كتاب السَّلام، باب تحريم الكهانة وإتيان الكهَّان، رقم (٢٢٢٨)، من حديث عائشة رضي الله عنها.

ساحیر لووتبەرزە و ڕووی لەخەڵکی وەردەگێڕێت، لەکاتێکدا ملکەچ و سەرشۆڕ و زەلیلە بۆ شەیتان و لێی دەترسێت، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلۡإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَزَادُوهُمۡ رَهَقًا ﴾ [الجن:٦] واتە: بێگومان کۆمەڵێك لەمرۆڤ پەنایان بردە بەر کۆمەڵێك لە جنۆکە ، کەچی ئەو جنۆکانە تەنها ترس و تۆقینی ئەو کەسانەیان زیاد دەکرد کە پەنایان پێدەبردن .

**لەبڵاوکراوەکانی**

(ماڵپەڕی بەهەشت ، ماڵپەڕی وەڵامەکان )

ماڵپەڕی بەهەشت ba٨.org ماڵپەڕی وەڵامەکان walamakan.com

## ئایا ساحیر بە خۆشی و بەختەوەریەوە دەژیت؟

ساحیر بە بەدبەختیەوە دەژێت لەم ژیانەدا، چونکە بەختەوەری ژیانی لەدەستداوە و شیرینی ئیمان و دینی لێ بزرە، ڕقی لە گوێبیستبوونی قورئانە و دەترسێت لە بانگدان، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ ﴾ [طه:١٢٤]. واتە: ئەوەی کە پشت لەو بیرخستنەوانە بکات کە من یادی دەخەمەوە ، ئەوا لەژیانی دونیایدا ژیانێکی تەسك و تروسك وناڕەحەتی هەیە ـ ئەگەرچی وا دیاربێت کە لە کەسانی چاکەکار و لای ڕاستە ـ ، و گۆڕەکەی لەسەر تەسك دەکرێتەوە و ئەشکەنجە دەدرێت تێیدا ، و لە ڕۆژی دوایشدا بەکوێری حەشری دەکەین لە بینایی وبینینی بەڵگەکان .

ساحیر کاتەکانی ژیانی لە دووری لەخەڵکیدا بەسەردەبات و گۆشەگیر و دوورەپەرێزە و مامەڵە و تیکەڵاویان ناکات مەگەر کاتێك نەبێت کە داوای لێ بکرێت سیحریان بۆ بکات و زیانێك بەوانی تر بگەیەنێت و شێخی ئیسلام بەڕەحمەت بێت حاڵی ساحیرانی بەم شێوەیە باس کردووە کە دەڵێت: بەرکەوتەی پیسیە و تێکەڵاوی سەگە و دەڕوات بۆ شوێنی فڕێدانی پاشەڕۆ و سەرئاوەکان و بۆنی ناخۆشە و خۆی پاك ناکاتەوە بەشێوەی شەرعی و خاوێن نییە[١] .

(١) مجموع فتاوى شيخ الإسلام (٢١٥/١١).

ساحیر بێ ئومێدە لە ژیان و بێ خەوە بەشەوان و ئاسوودەش نییە بە ڕۆژ، بەڵکو شەوی بە هەڵکردنی دوکەڵ و هەڵم و ناوی شەیتانەکان بەسەردەبات لەگەڵ نوشتە و لەشوێنەتاریك وپیسەکان و پاشان بەڕۆژ بە دڵتەنگیەوە دەخەوێت.

ئەمە حاڵی ساحیری پیس و خراپ و بێ خێرە (مەریدە)[1]،خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّـٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾ [فصلت:٤٦] واتە: هەرگیز پەروەردگارت ستەم لە بەندەکان ناکات.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴾[آل عمران:٥٦]. واتە: بەڵام ئەوانەی کە بێباوەڕبوون بە مەسیح لە جولەکەکان ، و ئەوانەش کە زێدەڕەویان تێداکرد لە گاورەکان ، سزایەکی توندیا دەدەم لە دونیادا : بە کوشتن و بردنی ماڵ و لەناوچوونی موڵك ، وە لە دواڕۆژیشدا بەئاگر سزایان دەدەم ، و هیچ پشتیوان و سەرخەرێکیشیان نیە سەریان بخات و سزای خوایان لەسەر ڕەتبکاتەوە .

وە هەر کارێك کە ساحیر ئەنجامی دەدات ئۆباڵەکەی بۆ خۆی و ئەو کەسە دەگەڕێتەوە کە سیحرەکەی بۆ کردووە و داوای لێکردووە، خوای

(١) المَرِيدُ: الخَبِيثُ المتَمَرِّدُ الشِّرِّيرُ، العَارِي من الخَيْر. غريب القرآن للسِّجستاني (ص٤١٣)، تاج العروس (١٦٥/٩).

گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ﴾[فاطر:٤٣]. واتە: لەڕاستیدا فڕوفێڵی خراپ هەر بەسەر خاوەنەکەیدا دەشکێتەوە.

وە ساحیر بۆ هەر کوێ بڕوات دۆڕان و ناڕەحەتی لەسەر نووسراوە و بۆی بڕاوەتەوە ئەوەتا خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ﴾ [طه:٦٩]،پێشەوا قورتوبی لە تەفسیریدا دەڵێت: واتە ساحیر سەرناکەوێت و ڕزگاری نابێت بۆ هەرکوێ بڕوات لەسەر زەویدا[(١)] .

وە کردەوەی ساحیر هەمووی پوچەڵە لای خوا لەبەرئەوەی کوفری بەخوا کردووە، وەکو دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ﴾ [الزمر:٦٥]. واتە: بێگومان وەحی بۆ تۆ ـ ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ـ و پەیامبەرانی پێش تۆش هاتووە : کە ئەگەر جگە لەخوا بکەیتە هاوەڵی ئەوا کردەوەت هەڵدەوەشێتەوە ودەبیت بە یەکێك لەڕەنجەڕۆ وئەوانەی دین ودوا ڕۆژیان دۆڕاندووە ، لەبەر ئەوەی لەگەڵ هاوەڵبڕیارداندا هیچ کردەوەیەکی چاك وەرناگیرێت .

جا ئیتر ئەو کەسەی سەردانی دەکات ئومێدی چی لێ دەکات؟ لەکاتێکدا ئەو بەڵێنی ئاگری پێ دراوە؟ و کێ هەیە هیوا و ئومێدی لەسەر هەڵچنێت کە خۆی بێ ڕێزترین کەسە لای خوای میهرەبان؟

(١) الجامع لأحكام القرآن (١١/٢٢٤).

## ساحیر چ سوودێکی دەستدەکەوێت لە سیحر؟

ساحیر سیحر دەکات لەپێناو دەستکەوتنی پێگەبەرزیەکی ساختە کە ناتەواوی خۆی پێ پڕبکاتەوە، لەبەر سوککردنی لەلایەن شەیتانەوە، ئەوەتا شێخی ئیسلام بەڕەحمەت بێت دەڵێت: دەبینیت ئەوانەی دەڕۆنە ناو سیحر و داواکردن لەئەستێرەکان و زیکرکردنیان و لەگەڵیان دەدوێن و سوجدەیان بۆ دەبەن، لەڕاستیدا بۆ دەستکەوتنی ماڵ و ناوبانگە، دەبینی کوفر وشیرك دەکات تەنها لەپێناو دەستکەوتنی سامان و گەورەبوونێکی خەیاڵی بە گومانی خۆی، کە بە پێچەوانەوە تەنها بەزیانی خۆیشی دەشکێتەوە و سوودی بۆی نییە وەکو لە واقعدا دەرکەوتووە و دیارە لە جیهاندا[1].

ساحیر دەکەوێتە شیرکەوە تەنها بە تەماحی پارە وسامان، ئەوەتا ئەو ساحیرانەی کە فیرعەون داوای لێ کردن کە ڕووبەڕووی موسا ببنەوە داوای پارە و ماڵیان لێی کرد و خوای گەورە لەو بارەیەوە بۆ مانی باس کردووەو دەفەرمووێت:﴿ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴾ [الشعراء:٤١-٤٢]واتە: جا جادوگەران هاتنە لای فیرعەون ووتیان : ئایا ئێمە هیچ پاداشت و خەڵات و سامانێکمان بۆ هەیە ئەگەر بەسەر موسادا سەرکەوتین؟ فیرعەونیش بەڵێنی

(١) مجموع فتاوى شيخ الإسلام (٣٨٥/٢٩).

پاداشــت و پلەی نزیکی پێدان لە خۆیەوە ، چونکە ســاحر حەزی بە ماڵ و پارە و خۆدەرخستنە.

هەروەها ساحیر ئەو سیحرە دەکات و دەزانێت بەوە دەبێتە کۆیلەی شەیتان، و شەیتان زیانێکی زۆری لێداوە و بەرژەوەندی زۆری لێ تێکداوە ولەدەستداوە، بۆیە هەوڵ دەدات زیان بە خەڵکی تریش بگەیەنێت و لەوبارەیەوە شێخی ئیسلام بەڕەحمەت بێت دەڵێت: شەیتان خودی خۆی پیسە، جا بۆیە ئەگەر خاوەن نوشتە و کەسانێك بە کردنی کرفر و شیرك لێی نزیك ببنەوە ئەوا وەکو ڕەشوە وبەرتیل وەهایە بۆیان، و ئەوانیش هەندێ لە مەبەست و داواکاریەکانیان بۆ بەدی دەهێنن، هەروەکو چۆن کەسێك پارە دەدات بە کەسێکی تر بۆ ئەوەی یەکێکی بۆ بکوژێت یان زینای لەگەڵدا بکات یان بۆی ئاسان بکات[١] .

(١) مجموع فتاوى شيخ الإسلام (٣٤/١٩).

## سزای ساحیر

لەبەر زۆری و گەورەیی مەترسی سیحر لەسەر تاك و كۆمەڵگە حوكمیان لەشەرعدا بریتیە لە كوشتنیان، بۆ ئەوەی كۆمەڵگە پشووبدات و بێباك بێت لە خراپەیان.

لە بەجالەی كوڕی عەبدەوە بەڕەحمەت بێت دەڵێت: پێشەوا عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ نووسراوی نارد بۆ كاربەدەستەكانی ژێر دەسەڵاتی خۆی و تێیدا ئەمەی نووسیبوو: هەموو ژن و پیاوێكی ساحیر بكوژن. رواهُ البَيهقيُّ في السُّنَنِ الكُبرى[(١)].

هەروەها بە صەحیحی هاتووە لە حەفصەوە ڕەزای خوای لێ بێت كە فەرمانی كردووە بە كوشتنی كەنیزەكێكی كە سیحری لێ كردبوو، وە كوژرا. رواهُ مالكٌ في المُوَطَّأ[(٢)].

ئەمەش پاداشتی ئەو كەسەیە كە كوفر بە خوا دەكات و ئازاری بەندەكانی خوا دەدات لە دونیادا، بەڵام پاداشتی لە ئاخیرەتدا ئەوەیە كە خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴾ [البقرة:١٠٢] واتە: بێگومان جولەكە باش دەیانزانی كە هەركەس جادوكردن هەڵبژێرێ و واز لە هەق بهێنێت ئەوا لە دواڕۆژدا لە چاكە هیچ بەشێكی نیە.

---

(١) كتاب القسامة، باب تكفير السَّاحر وقتله إنْ كان ما يسحر به كلام كفر صريح، رقم (١٦٤٩٨).

(٢) كتاب العقول، ما جاء في الغيلة والسِّحْر، رقم (٣٢٤٧)، عن مُحمَّد بن عبد الرَّحxمن رحمه الله.

## ئەو کەسەی داوای سیحر دەکات هاوبەشی ساحیرە لە تاواندا

هەرکەس بڕوات بۆ لای ساحیر بۆ ئەوەی سیحری بۆ بکات ئەوا دینەکەی بە دونیا فرۆشتووە، و خۆی تووشی تووڕەیی خوا کردووە بە ئەنجام دانی هەڵوەشێنەرەوەیەك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام کە سیحرە و رازی بوونە بە سیحر، شێخ موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب بەڕەحمەت بێت دەڵێت: هەرکەس سیحر ئەنجام بدات یان ڕازی بێت پێی ئەوا کوفری کردووە[(١)].

سەردانیکەری ساحیر بۆ ئەوەی زیان بە کەسانی تر بگەیەنێت گەیشتۆتە ئەوپەڕی پلەی حەسادەت، لەبەر ئەوەی ئیرەیی بردووە بە غەیری خۆی لەسەر نیعمەتێك کە خوا پێی بەخشیوە، و ئاخیرەتی خۆی لەدەستداوە بەشوێنکەوتنی هەوا و ئارەزووی خۆی و ڕازی نەبوونی بەقەزاو قەدەر.

سەردانیکەری ساحیر هەڵەیەکی کردووە کە تێیدا و لەیەك کاتدا سەرپێچی خوای کردووە و هەمیش ستەمی لە خەڵکی کردووە.

لەڕاستیشدا ئەوەی هەوڵی زیان گەیاندن بدات بە کەسانی تر ناگات بە ئامانج و خوای گەورە پلەی ستەملێکراو بەسەر ستەمکاردا بەرز دەکاتەوە، و هەندێ جار ئاواتەکانی کەسی سیحر لێکراویش دێنێتە دی ، شێخی ئیسلام بەڕەحمەت بێت دەڵێت: ڕقی کەسی حەسوود بۆ نیعمەتێکی خوا بەسەر بەندەیەکەوە نەخۆشیە، وە ئەو نیعمەتە یان گەورەتر لەوە بۆ کەسی حەسوودی

(١) نواقض الإسلام - ضمن المستوى الأوَّل من متون طالب العلم - بتحقيقنا (ص٢٧).

پێبراو دەگەڕێتەوە، و جاری واش هەیە هاوشێوەی ئەو نیعمەتە بۆ هاوشێوەی ئەو کەسە حەسوودی پێبراوە دەگەڕێتەوە و دەستی دەکەوێت[1].

جا ئەی ستەمکار هێواش ولەسەرخۆبە، چونکە ئۆباڵی سیحرەکەت بەسەر خۆتدا دەشکێتەوە و پێدەچێت خوای گەورە کەسێکت بەسەردا زاڵ بکات کە ئازارت پێ بگەیەنێت بەسیحر یان شتی تر.

وَمَـا مِنْ يَـدٍ إِلَّا يَـدُ اللَّـهِ فَوْقَهَـا وَمَا ظَالِمٌ إِلَّا سَيُبْلَى بِظَالِمِ[2]

واتە : هیچ دەستێک نیە ئیللا دەستی خوا لەسەروی ئەو دەستەوەیە

هیچ ستەمکارێکیش نیە ئیلا ستەمکارێکی تر بەسەریدا زاڵ دەبێت

خوای گەورە دەفەرموێـت: ﴿ وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦ ﴾ [فاطر:٤٣]، پێشەوا ابن کەسیر بەڕەحمەت بێت لە تەفسیریدا دەڵێت: ئۆباڵی ئەوە تەنها بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە نەوەك غەیری خۆیان... و موحەممەدی کوڕی کەعبـی قورەزی بەرەحمەت بێت دەڵێت: سێ شت هەن هەرکەس ئەنجامیان بدات رزگاری نابێت هەتا بەسەر خۆیدا ڕوو نەدات: فێڵ و دەستدرێژی و بەڵێن شکێنی و لەقورئانیشدا پشتڕاستکراونەتەوە[3].

(١) مجموع فتاوى شيخ الإسلام (١١٢/١٠).

(٢) التَّمثيل والمحاضرة (ص١٠)، المدخل إلى تقويم اللِّسان (ص٥٤٩).

(٣) تفسير ابن كثير (٥٥٩/٦).

وه دوعای ئەو کەسـه سـتەملێکراوەی کە سـیحری لێکراوه بەشـەو و ڕۆژ بەرزدەبێتەوه بۆ لای خوا و خوای بیسـەریش بەڵێنی وەڵا مدانەوەی دو عای ستەملێکراوی داوه، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێـت: «ثَلَاثُ دَعَوَاتٍ مُسْـتَجَابَاتٌ لَا شَـكَّ فِيهِنَّ: دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ، وَدَعْوَةُ الْمُسَـافِرِ، وَدَعْوَةُ الْوَالِدِ عَلَى وَلَدِهِ» رواهُ الترِّمذيُّ[1] .واته: سێ دوعا گیرادەبن و گومانی تێدانییه: دوعای ستەم لێکراو، دوعای ڕێبوار، دوعای دایك وباوك لەسەر رۆڵەکەی.

وه هەرکەس فێڵ له خەڵکی بکات خۆ بەدڵنیاییەوه ناتوانێت فێڵ له خوای پەروەردگار بکات و خوای گەوره خۆی فەرموویەتی: ﴿ قُلِ ٱللَّهُ أَسْرَعُ مَكْرًا ﴾ [یونس:٢١]. واته: خوای پەروەردگار به پەلەتر و خێراتره له مەکر و مۆڵەتدان بۆ ڕۆچوون له تاوان و سەرکەشی و سزادانی ئێوه.

کەسانی بێتاوان و سـتەملێکراو، کەسـێك هەیه کە بەرگریان لێ بکات، ئەوەتا خوای باڵادەسـت دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ﴾ [الحج:٣٨]. واته: بێگومان خوای بەرز وبڵند وپایەبەرز باوەڕداران لەدوژمنایەتی وسـتەم وفێڵ وخراپەی بێباوەڕان دە پارێز ێت ، چونکه خوای

(١) أبواب البِرِّ والصِّلة، باب ما جاء في دَعْوة الوالدين، رقم (١٩٠٥)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

پەروەردگار هەموو ئەوانەی خۆش ناوێت کە ناپاکی وخیانەت لەسـپاردەی پەروەردگاریان دەکەن و نکوڵیکارن لەنیعمەت وبەخششەکانی .

وە ئایندەی ستەم و دەستدرێژی سەرشۆڕیە و خاوەنەکەی بەڵێنی سزایەکی بەئێش و ئازاری پێ دراوە و خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَظۡلِم مِّنكُمۡ نُذِقۡهُ عَذَابٗا كَبِيرٗا﴾ [الفرقان:١٩]. واتە: ئەوەی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاربدا و ستەم لەخۆی بکات و جگە لە خوا بپەرستێ ، و لەسەر ئەو بیروباوەڕە بمرێت ئەوا خوا سزایەکی سەختی بەئازاری دەدات .

سەردانیکەری ساحیر نێچیری شەیتانە بۆ دەرچوون لە دین، بیری چۆتەوە کە دونیا چەند کورتە و سبەی دەخرێتە شوێنێکی تەسکی تاریکەوە بەتەنها و لەبەردەست خوا دەوەستێنرێت و دادگایەکی دادپەروەر چاوەڕێی دەکات و مافی سیحرلێکراوی لێ دەسێنرێت.

جا هەر ئێستا تەوبە بکە و واز لەو کارەت بهێنە و پێش ئەوەی بەڵات بەسەردا بێت فریای خۆت بکەوە.

***

## خۆپاراستن لە سیحر پێش ڕوودانی

خوای گەورە مرۆڤی دروست کردووە و دوژمنیشی بۆ داناوە و هاوکات چەند هۆکارێکی بۆ فەراهەم کردووە کە بتوانێـت بەهۆیانەوە خۆی پێ لەخراپە بپارێزێت و لەوانەش:

١ - پشت بەخوا بەستن، بۆیە باوەڕدار دڵی بەخواوە پەیوەست دەکات و تەواوی کاروباری بەو دەسپێرێت و چاك دەزانێت کە هیچ شتێکی تووش نایەت یان هیچ زیانێکی لێ نادرێت مەگەر بە ئیزنی خوای کاربەجێ نەبێت، ئەوەتا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَو اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ؛ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ، وَلَو اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ؛ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلَامُ وَجَفَّتِ الصُّحُفُ» رواهُ التِّرمذيُّ[١] . واتە: بزانە بەڕاستی ئەگەر هەموو ئوممەت کۆببنەوە بۆ ئەوەی بە شتێك سوودت پێبگەیەنن ئەوا سوودت پێناگەیەنن تەنها بەو شتە نەبێت کە خوا بۆتی نووسیوە ، وە ئەگەر کۆیشببنەوە بۆ ئەوەی بە شتێك زەرەر و زیانت پێبگەیەنن ئەوا زەرەر و زیانت پێناگەیەنن تەنها بەو شتە نەبێت کە خوا لەسەرتی نووسیووە ، قەڵەمەکانی نووسینی قەدەر هەڵگیراون و پەڕەکانیش وشك بوونەتەوە .

(١) أبواب صفة القيامة والرَّقائِق والورع، رقم (٢٥١٦)، من حديث ابن عبَّاسٍ رضي الله عنهما.

وە هەموو سیحرێکیش کارناکات و کاریگەری نابێت لەسەر کەسی سیحرلێکراو، لە واقعیشدا چەندین ساحیر هەیە کە سیحریان کردووە و کەچی کاریگەری نەبووە لەسەر سیحرلێکراو، وە شەیتان کەی و چۆن خۆی بەتەنها دەسەڵاتی ئەوەی هەیە کە ئەم جیهانە و گەردوون تێك بدات بەبێ ئەوەی ویست و ئیزنی خوای گەورەی لێ بێت؟! خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ [البقرة:١٠٢]. واتە: بێگومان جادوگەران ناتونن بە جادو زیان بەکەس بگەیەنن مەگەر بە ئیزنی خوای پەروەردگار و قەزا و قەدەری ئەو .

٢ - زۆر زیکری خوا کردن لە قورئان خوێندن واستغفار و سبحان الله و جۆرەکانی تری زیکر، چونکە وەکو قەڵایەکی پارێزەر وەهایە لە خراپە و زیان، جا هەرکات خەڵکی لەخوا دوورکەوتنەوە و پەنایان بۆ غەیری ئەو برد ئەوا موسیبەت و بەڵایان لەسەر قورس وگەورە دەبێت و شەیتان و جنۆکەکان لێیانەوە نزیك دەبن.

پێشەوا ابن القيم بەرەحمەت بێت دەڵێت: دڵ هەرکات پڕبوو لەزیکری خوا و ئاوەدان بوو بە ڕێنماییەکانی ئەو و زیکر و پەناپێگرتنی و زمان و دڵی هاوتای یەکدی بوون ئەوا لەگەورەترینی هۆکارەکانە کە ڕێگرە لە تووش بوونی بەسیحر و یەکێکە لە باشترین چارەسەرەکانیش دوای تووش بوونی بەسیحر[(١)] .

(١) زاد المعاد (١١٦/٤).

٣ - دووربون لە تاوان و سەرپێچی، بەتایبەت گوێ گرتن لە گۆرانی، چونکە کاریگەرترین هۆکارە بۆ ڕاکێشانی شەیتانەکان و نەفسە خراپ و چەپەڵەکان بۆ ناوماڵ کە هاوکات قورئان خوێندن و زیکری خوا دەریان دەکات.

٤ - پارێزگاری کردن لە ئەنجامدانی نوێژی بەیانی لە مزگەوت بە کۆمەڵ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ صَلَّى الصُّبْحَ؛ فَهُوَ فِي ذِمَّةِ اللَّهِ» رواهُ مُسلمٌ[(١)]، واتە: ئەوەی نوێژی بەیانی بەجەماعەت بکات ئەوا لە ژێر پاراستن و ئەمانەتی خوادایە. جا بۆیە ئەو کەسەش کەلە ژێر پاراستنی خوادا بێت بێگومان شەیتان هیچ ڕێگەیەکی بۆ فریودانی نابێت.

٥ - خوێندنی سورەتی بەقەرە لە ماڵدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اقْرَؤُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ؛ فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ، وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلَا تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ[(٢)]» رواهُ مُسلمٌ[(٣)] واتە: سورەتی بەقەرە بخوێنن چونکە خوێندنی پیت و بەرەکەتەو، وازلێهێنانی مایەی پەشیمانی و خەفەتە، کەسانی بێورەو کەمتەرخەم پێی ناوێرن و ناتوانن. معاویە دەڵێ: پێم گەیشتووە کە کەسانی بێورە مەبەستی جادووگەرانە.

(١) كتاب المساجد ومواضع الصَّلاة، باب فضل صلاة العشاء والصُّبح في جماعة، رقم (٦٥٧)، من حديث جندب بن عبد اللَّه رضي الله عنه.

(٢) أي: السَّحَرَة. غريب الحديث لابن الجوزي (١/٧٧).

(٣) كتاب صلاة المسافرين وقصْرها، باب فضل قراءة القرآن، وسورة البقرة، رقم (٨٠٤)، من حديث أبي أُمامة الباهلي رضي الله عنه.

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْفِرُ مِنَ البَيْتِ الَّذِي تُقْرَأُ فِيهِ سُـــورَةُ البَقَرَةِ» رواهُ مُســـلمٌ[1]. واتە: لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان، چونکە بەڕاستی شەیتان ڕا دەکات لەو ماڵەی کە سورەتی بەقەرەی تێدا دەخوێنرێت.

٦ - پارێزگاری کردن لە خوێندنی هەردوو سورەتی فەلەق و ناس لەبەیانیان و ئێواراندا، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەت بۆ عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەکات بەخوێندنەوەیان و پێی دەفەرموێت: «تَعَوَّذْ بِهِمَا؛ فَمَا تَعَوَّذَ مُتَعَوِّذٌ بِمِثْلِهِمَا» رواهُ أبو داودَ[2]. ئەی عوقبە! پەنایان پێ بگرە، چونکە هیچ پەناگرێك نیە پەنای بە شتێك گرتبێت بەوێنەی ئەم دوو سورەتە.

پێشەوا ابن القیم بەڕەحمەت بێت دەڵێت: پێویستی بەندە بۆ پەناگرتن بەم دو سورەتە گەورەترە لە پێویستی بە خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگ[3].

٧ - زۆر پەناگرتن بە خوا بە وتنی ئەم زیکرەی کە لەم فەرموودەیەدا هاتووە لەشەو و ڕۆژدا و لەکاتی دابەزین و لادان و مانەوە لەهەر شوێن و جێگایەکدا لە ئاسمان بێت یان بیابان یان دەریا، پێغەمبەری خوا ﷺ

(١) كتاب صلاة المسافرين وقصْرها، باب استحباب صلاة النَّافلة في بيته، وجوازها في المسجد، رقم (٧٨٠)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.
(٢) كتاب الصلاة، باب في المعوِّذتين، رقم (١٤٦٣).
(٣) بدائع الفوائد (٢/١٩٩).

فەرموویەتی: «مَنْ نَزَلَ مَنْزِلاً ثُمَّ قَالَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ؛ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْ مَنْزِلِهِ ذَلِكَ» رواهُ مُسلمٌ[(١)]. واتە: هەر کەس لە مەنزڵێکدا هەواری هەڵدا پاشان وتی: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا لە زیانی هەموو شتێ کە ئەو دروستی کردووە، ئەوە هیچ شتێك زیانی پێناگەیەنێ تا کۆچ دەکات لەو شوێنە.

٨. خوێندنی دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی بەقەرە لە سەرەتای شەوەوە، کە ئەم دوو ئایەتەن: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨٥ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ [البقرة:٢٨٥-٢٨٦]. واتە: پەیامبەری خوا ﷺ باوەڕی هێناوە ویەقینی هەیە بەو سروشەی بۆی هاتوە لەلایەن پەروەردگاریەوە و بەڕاستی دەزانێت ، و هەقی خۆشیەتی کە یەقینی هەبێت ، و باوەڕدارانیش بەهەمان شێوە باوەڕیان هێناوە بەقورئانی پیرۆز و کاری

(١) كتاب الذِّكر والدُّعاء والتَّوبة والاستغفار، باب في التَّعوُّذ من سوء القضاء ودَرَك الشَّقَاء وغيره، رقم (٢٧٠٨)، من حديث خَوْلَة بنت حكيم رضي الله عنها.

پێدەکەن ، هەمویان باوەڕیان هێناوە بە ( الله ) کە پەروەردگار و پەرەستراویان بێت کە سـیفاتی مەزنی وتەواوی تێدایە ، وە بەوەی کە خوای پەروەردگار کۆمەڵێك فریشـتەی بەرێزی هەیە ، وە بەوەش کە کتێبی دابەزانـدوە ، وە بەوەش کە پەیامبەرانێکی بۆ خەڵك ناردوە ، ــــ ئێمەی باوەڕداران ــــ ئەوە نەبێت باوەڕمان بەهەندێکیان هەبێت و بەهەندێکی تریشـیان باوەڕمان نەبێت ، بەڵکو باوەڕمان بەهەمو یان هەیە . پە یامبەر و باوەڕدارانیش ووتوو یانە : گوێمان لەوە بوو کە بەوەحی داتبەزاندوە ، و گوێڕایەڵین لەهەموو ئەوانەدا ، ئومێدەوارین ــــ بەفەزڵی خۆت ـ لەتاوانەکانمان خۆش بیت ، ئەوە تۆی پەروەردەمانت کرد بەو نیعمەتانەی کە پێمانت بەخشـیوە ، و تەنها بۆ لای تۆیە سـەرەنجام و گەڕانەوەمان . ئایینی خوای پەروەردگار ئاسـانە وگرانی تێدا نیە ، خواش داوای شـتێك لەبەندەکانی نا کات کە لەتوا نا یا ندا نەبێت ، جا هەر کەس چاکە بکات چاکەی دەسـت دەکەو ێت ، وە هەر کەسـێکیش خراپە بکات خراپەی دەسـت دەکەو ێت . پەروەرد گارا سـزا مان مەدە ئەگەر شـتێکمان لەبیرچووەوە لەوەی فەرزت کردوە لەسەرمان ، یان هەڵەمان کرد و شتێکمان کرد کە یاساغیت لێکردوە ، پەروەردگارا کارانێکی قورسی وامان نەخەیتە سەرشان کە خستە سەرشانی سەرپێچی کارانی پێش ئێمە وەکو سزایەك بۆیان ، پەروەردگارا داواکاری وامان بەسەرشاندا نەدەیت لە داواکاری و مو سیبەت کەتوانای هەڵگرتنیمان نیە ، و تاوانەکانمان بسڕەوە ، و عەیب و عارەکانمان بپۆشـە ، و چاکمان لەگەڵ بکە ، و تۆ کاروباری ئێمەت

بەدەستە وبەڕێوەی دەبەیت ، سەرمان بخە بەسەر ئەوانەی نکوڵیکار و بێباوەڕن بەئایینەکەت و تاك و تەنهاییت ، و پەیامبەرەکەت موحەممەد ﷺ بەدرۆ دەزانن ، و عاقیبەت وسەرئەنجام با بۆ ئێمە بێت بەسەریاندا لە دونیا و دوارۆژدا .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ قَرَأَ بِالآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ البَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ؛ كَفَتَاهُ» متَّفقٌ عليه[(١)]. واتە: دوو ئایەتی کۆ تایی سورەتی بەقەرە ئەوەی بیانخوێنێت لە شەودا بەسیەتی.

٩. خوێندنی ئایەتی کورسی لە کاتی خەوتندا، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ قَرَأَهَا إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ؛ فَإِنَّهُ لَنْ يَزَالَ مَعَهُ مِنَ اللَّهِ حَافِظٌ، وَلَا يَقْرَبُهُ شَيْطَانٌ حَتَّى يُصْبِحَ» رواهُ البخاريُّ[(٢)]. واتە: هەرکەس ئایەتی کورسی بیخوێنێ کاتێك کە دەچێت بۆ سەر جێگای خەوتنی، ئەوا بەردەوام لەلایەن خواوە پارێزەرێکی لەگەڵدایە و شەیتان نزیکی ناکەوێتەوە هەتا بەیانی دەکاتەوە.

١٠. خواردنی حەوت خورمای عەجوە - جۆرێکە لە خورمای شاری مەدینە - لە بەیانیاندا، بۆ ئەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ تَصَبَّحَ بِسَبْعِ

---

(١) رواه البخاري، كتاب فضائل القرآن، باب فضل سورة البقرة، رقم (٥٠٠٩)، ومسلم، كتاب صلاة المسافرين وقصْرها، باب فضل الفاتحة، وخواتيم سورة البقرة، والحثِّ على قراءة الآيتين من آخِرِ البقرة، رقم (٨٠٧)، من حديث أبي مسعود رضي الله عنه.

(٢) كتاب فضائل القرآن، باب فضل سورة البقرة، رقم (٥٠١٠)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

تمَرَاتٍ عَجْوَةً؛ لَمْ يَضُرَّهُ ذَلِكَ اليَوْمَ سُـمٌّ، وَلَا سِـحْرٌ» متَّفقٌ عليه[١]. واتە: هەر كەس ژەمی بەیانی یەكەی حەوت دەنك خورمای عەجوە بێت ئەو رۆژە ژار و جادو زیانی پێناگەیەنن.

١١. پارێزگاری كردن لە زیكرەكانی بەیانیان و ئێواران، لەوانە:

أ. خوێندنی ئایەتی كورسـی : ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ [البقرة:٢٥٥]. واتە: ( الله ) یە كە جگە لەو هیچ شـتێك شـایسـتەی یەكتاپەرسـتی و پەرسـتن نیە ، و زیندوشـە بەهەموو واتایەكی زیندویەتی و تەواوێتی ژیان بە شێوەیەك كە لایق و شایستەی گەورەیی ئەو بێت ، و ڕاگری هەموو شـتێكیشـە ، نە خەوەنوچكە و نەش خەو نایباتەوە ، هەرچی لە ئاسـمانەكان و لە زەویشـدایە هەموو موڵكی ئەون ، وە كەس ناوێرێت تكای لەلادا بكات مەگەر پاش ئیزن پێدانی خۆی نەبێت ، زانسـتی ئەو سـەرجەم دروستكراوەكانی گرتوەتەوە ڕابردو و ئێستا و داهاتویان ، دەزانێت چی دێتە پێش دروسـتكراوەكانی لەئایندەدا ، و ئەوەشـی ڕابوردوە لەشـتە ڕابوردەكان ، وە هیچ یەكێك لەدروستكراوەكانی ناتوانێت ئاگادار بێت لەزانستی ئەو ـــ ئەگەر شتێكی كەمیش بێت ـ جگە لەوانەی كە خوای پەروەردگار خۆی ویستی لەسەرە كە فێری

---

(١) رواه البخاري، كتاب الأطعمة، باب العَجْوَة، رقم (٥٤٤٥)، ومسلم، كتاب الأشربة، باب فضل تمر المدينة، رقم (٢٠٤٧)، من حديث سعد بن أبي وقاص رضي الله عنه.

بکات وپێی ڕابگەیەنێت . وە فراوانی کورسیەکەی ئا سمانەکان و زەوی گرتۆتەوە ، کورسیش : شوێنی هەردو پێی پەروەردگاری بەرز و شکۆمەندی بێ وێنەیە ، و کەسیش چۆنیەتەکەی نازانێت تەنها خوای پاك و بێگەرد نەبێت ، وە پاراستنی ئەوانە هیچ قورس نیە لەلای ئەو ، و بەرز و بڵند و پایەبەرزە بە زات و سیفەتەکانی بەسەر سەرجەم دروستکراوەکانیدا ، و کۆکەرەوەی سەرجەم سیفەتەکانی گەورەیی و شکۆداریە . وە ئەم ئایەتەش گەورەترین ئایەتە لە ئایەتەکانی قورئان ، و پێی دەوترێت : ئایەتی کورسی .

ب. خوێندنی المُعَوِّذَتَيْنِ،کە بریتین لەم دوو سورەتە:

﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾ ﴾ [الفلق:١-٥].

واتە: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ بڵێ : پەنادەگرم و هانادەم بۆ لای پەروەردگاری ( الفلق ) کە بەرەبەیانە . لە خراپەی هەموو دروستکراوەکان و ئەزیەت و ئازاریان . وە لە خراپەی شەوێکی زۆر تاریکی شەوەزەنگ ، کە دێت بەسەردا و دادێت ، وە لە هەموو ئەو خرا پانەی کە تێیدایە و هەموو ئەزیە تدەرە کانیش . وە لە خراپەی هەموو ئەو جادوگەرە ئافرە تانەی کە فوو دەکەن بە گرێدراوە جادوییە کانیان ، بەمەبە ستی جادووکردن . وە لە خراپەی ئەو حە سودانەی کە ڕقیان لە خەڵکە ، لە کاتێکدا حەسودی بەخەڵك دەبەن بەرامبەر بەو نیعمەتانەی کە پەروەردگار پێی بەخشیون ، و دەیانەوێت ئەو نیعمەتەیان تێدا نەمێنێت ، و تووشی ئەزیەتیان بکەن.

﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ١ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ٢ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ٣ مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ٤ ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ ٥ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴾[الناس:١-٦]. واته: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ بڵـــێ : پەنادەگرم و هانادەبەم بۆ لای پەروەردگاری خەڵك ، کە تەنها خۆی توانای ڕەتکردنەوەی شەڕ و خراپەی شەیتانی وە سوە سەکاری هەیە لە دڵ و دەروونی خەڵکدا . پاد شای خەڵك : کە توانای بەڕێوەبردنی کاروباریانی هەیە ، و دەوڵەمەندە و پێویستیشی پێیان نیە . پەر ستراوی خەڵك : کە هیچ پەر ستراوێکی ڕا ست و شایستەیان نیە جگە لەو . لە ئەزیەتدانی ئەو شەیتانەی ، کە وەسوەسە دەخاتە دڵەکانەوە لە کاتی بێ ئاگایی ، و لە کاتی یادکردنی پەروەردگاریشـــدا نامێنێت و دوردەکەوێتەوە . ئەوەی کە خراپە و گومان دەخاتە دڵ و دەروونی خەڵکەوە . لە شـــەیتانەکانی جنۆکە و مرۆڤ .

ج. وتنی ئەم زیکرە سێ جار: «بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ، وَهُوَ السَّمِيعُ العَلِيمُ» ئەوەش لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ، وَهُوَ السَّمِيعُ العَلِيمُ - ثَلَاثَ مَرَّاتٍ -؛ لَمْ تُصِبْهُ فَجْأَةُ بَلَاءٍ حَتَّى يُصْبِحَ، وَمَنْ قَالَهَا حِينَ يُصْبِحُ - ثَلَاثَ مَرَّاتٍ -؛ لَمْ تُصِبْهُ فَجْأَةُ بَلَاءٍ حَتَّى يُمْسِيَ» رواهُ أبو

داودَ[1]. واتە: هەرکەس سێ جار بڵێت: بەناوی ئەو خوایەی کە لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێك زیانی نابێت لە زەوی و ئاسماندا وئەو بیسەر و زانایە، ئەوا بەڵای لەناکاوی تووش نابێت هەتا بەیانی دەکاتەوە، وە هەرکەسیش سێ جار لە بەیانیاندا بیڵێت ئەوا بەڵای لەناکاوی تووش نابێت هەتا ئێوارەی بەسەردا دێت.

د. وتنی ئەم زیکرە: «أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ»، ئەبی هورەیرە ﷺ دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئای چ ئازارم گەیشت لە دوپشکێك ئەمشەو گەستمی ئەویش فەرمووی: أَمَا لَوْ قُلْتَ حِينَ أَمْسَيْتَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ لَمْ تَضُرَّكَ» رواهُ مُسلمٌ[2].واتە: ئەگەر سەر لە ئێوارە بتوتایە؛ پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا لە زیانی ئەو شتانەی دروستی کردووە، ئەو دوپشکە زیانی بۆت نەدەبو.

هـ . وتنی ئەم زیکرە: «أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ الَّتِي لَا يُجَاوِزُهُنَّ بَرٌّ، وَلَا فَاجِرٌ، مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ وَذَرَأَ وَبَرَأَ، وَمِنْ شَرِّ مَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ، وَمِنْ شَرِّ مَا يَعْرُجُ فِيهَا، وَمِنْ شَرِّ مَا ذَرَأَ فِي الْأَرْضِ، وَمِنْ شَرِّ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا، وَمِنْ شَرِّ فِتَنِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَمِنْ شَرِّ كُلِّ طَارِقٍ إِلَّا طَارِقاً يَطْرُقُ بِخَيْرٍ يَا رَحْمَنُ» رواهُ أحمدُ[3]. واتە:

(١) كتاب الأدب، باب ما يقول إذا أصبح، رقم (٥٠٨٨)، من حديث عثمان بن عفَّان رضي الله عنه.

(٢) كتاب الذِّكْر والدُّعاء والتوبة والاستغفار، باب في التَّعوُّذ من سُوء القضاء ودَرَك الشَّقاء وغيره، رقم (٢٧٠٩).

(٣) في المسند، رقم (١٥٤٦١)، من حديث عبد الرَّحْمن بن خَنْبَشٍ التَّميميِّ رضي الله عنه.

پەنا دەگرم بەو وشە تەواوانەی خوای گەورە کە هیچ بەندەیەکی چاکەکار و خراپەکاریش ناگەن بەوپەڕی زانست و زانینی، لە خراپەی ئەوەی دروستی کردووە وبەدی هێناوە، و لە خراپەی ئەوەی دادەبەزێت لە ئاسمان لە بەڵا و موسیبەت و خراپەی ئەوەشی کەبەرز دەبێتەوە بۆی لە تاوان وسەرپێچی، ولە خراپەی ئەوەی دروستی کردووە لەناو زەویدا و خراپەی ئەوەشی کە لێیەوە دەردەچێت و خراپەی فیتنەی شەو و ڕۆژ و خراپەی هەموو ڕووداوێك کە بەشەوان ڕوودەدات جگە لە ڕووداوی خێر نەبێت ئەی ڕەحمان.

و. وتنی ئەم زیکرە حەوت جار: «حَسْبِيَ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ». لە ئەبو دەردائەوە ﷺ دەڵێت: «مَنْ قَالَ إِذَا أَصْبَحَ وَإِذَا أَمْسَى: حَسْبِيَ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ - سَبْعَ مَرَّاتٍ -، كَفَاهُ اللَّهُ مَا أَهَمَّهُ صَادِقاً كَانَ بِهَا أَوْ كَاذِباً» رواه أبو داود[(١)]. واتە: هەرکەس بەیانیان و ئێواران حەوت جار بڵێت: ئەو خوایەم بەسە کە هیچ خوایەکی تر نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها ئەو نەبێت و پشتیش هەر بەو دەبەستم، ئەو خاوەنی عەرشی هەرە گەورەیە. ئەوا خوای گەورە خەم و سەرقاڵی دونیا و دوا ڕۆژی بۆ ئاسان دەکات ئیتر ڕاستگۆ بێت تێیدا یان درۆزن بێت.

ز. ئەبو بەکر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم پێ بڵێ کە بەیانیان و ئێواران بیڵێم؟ ئەویش فەرمووی: بڵێ: اللَّهُمَّ عَالِمَ الغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، فَاطِرَ

(١) كتاب الأدب، باب ما يقول إذا أصبح، رقم (٥٠٨١).

السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ، قَالَ: قُلْهُ إِذَا أَصْبَحْتَ، وَإِذَا أَمْسَيْتَ، وَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ» رواهُ التِّرمذيُّ[(١)] واتە: ئەی پەروەردگاری زانا بە پەنهانی و ئاشكرا، بەدی هێنەری ئاسمانەكان و زەوی، پەروەردگار وخاوەنی هەموو شت، شایەتی دەدەم كە هیچ خوایە نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ نەبێت، پەنات پێ دەگرم لە خراپەی نەفسم و خراپەی شەیتان وئەوەی بانگەوازی بۆ دەكات لە شیرك وكوفر، جا بەیانی و ئێوارە و ئەو كاتەش كە دەچیتە سەر جێگای خەوتنت بیخوێنە و بیڵێ.

ح. وتنی ئەم زیكرە: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ»، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، فِي يَوْمٍ - مِئَةَ مَرَّةٍ -؛ كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِئَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِئَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ حِرْزاً مِنَ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ، إِلَّا أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ» متَّفقٌ عليه[(٢)].واتە: هەر كەس لە ڕۆژێكدا سەد جار بڵێ: هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە (الله) نەبێت تاك و تەنیاو

(١) أبواب الدَّعوات، رقم (٣٣٩٢)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

(٢) رواه البخاري، كتاب بدء الخلق، باب صفة إبليس وجنوده، رقم (٣٢٩٣)، ومسلم، كتاب الذِّكر والدُّعاء والتَّوبة والاستغفار، باب فضل التَّهليل والتَّسبيح والدُّعاء، رقم (٢٦٩١)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

بێهاوەڵە، موڵك و دەسەڵات هەر بۆ ئەوە و سوپاس و ستایشیش هەر شایانی ئەوە، ئەو بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە، ئەوە وەك ئەوە وایە دە بەندەی ئازاد كردبێت و، سەد چاكەی بۆ دەنوسرێت و سەد گوناهی لەسەر لادەبرێت و دەبێتە سپێر بۆی لە شەیتان لەو ڕۆژەیدا تا ئێوارە، كەس چاكتری نەكردووە لەوەی ئەو كردوویەتی، مەگەر كەسێك زیاتر لەوەی كردبێت.

جا بۆیە لەڕاستیدا پشتگوێ خستنی زیكرەكانی بەیانیان و ئێواران یەكێكە لە گەورەترینی هۆكارەكانی زاڵ بوونی شەیتان بەسەر مرۆڤدا و هەروەها تووش بوون بەچاو، ئەوەتا پێشەوا ابن القیم بەڕەحمەت بێت دەڵێت: زۆرترین حاڵەتی زاڵ بوونی ڕۆحە پیسەكان بەسەر خەڵكیدا كە تووشیان دەكەن بەهۆی كەم دینداریەوەیە و دڵوێرانبوونیان و بەتاڵی زمانیان لەوەی زیكری پێ بڵێت و پەنای پێ بەخوا لێ بگرن[١].

(١) زاد المعاد (٦٣/٤).

## چۆنێتی خوێندنی زیکرەکان بەسەر منداڵ و ئافرەتاندا

زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران بریتین لەکۆمەڵە دوعایەك کە مرۆڤ خۆیانی پێ دەپارێزێت لە شەڕ و خراپەی مرۆڤ و شەیتان، و مەرجیش نییە لەکاتی خوێندنی زیکرەکاندا فووپێداکردنی لەگەڵدا بێت وەکو چۆن مەرج نییە لەوکاتەدا منداڵەکەت یان هاوسەرەکەت ئامادە بێت لەلاتدا، چونکە زیکرەکان لە دوعا پێك دێن و تۆش دوعایان بۆ دەکەیت کە خوا بیانپارێزێت.

**جا چۆنێتی خوێندنی زیکر و ویردەکان بەسەر منداڵ و هاوسەر یان خزمێکت یان کەسی تر بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:**

دەڵێیت:

١ - أُعِيذُكُمْ بِرَبِّ الفَلَقِ، مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، وَمِنْ شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ، وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي العُقَدِ، وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ.

٢ - أُعِيذُكُمْ بِرَبِّ النَّاسِ، مَلِكِ النَّاسِ، إِلَهِ النَّاسِ، مِنْ شَرِّ الوَسْوَاسِ الخَنَّاسِ، الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ، مِنَ الجِنَّةِ وَالنَّاسِ.

**٣ - أُعِيذُكُمْ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ، مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ[(١)] ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ[(٢)]**؛ پێغەمبەری خوا ﷺ حەسەن و حوسەینی بەمە پەنا پێ داوە و بەسەریاندا خوێندوویەتی. رَواهُ البخاريُّ[(٣)] .

**٤ - أُعِيذُكُمْ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ - ثَلَاثاً -.**

باقی دوعاکانی تریش بەم شێوەیە.

(١) هَامَّة:کۆی وشەی هەوامە واتە ئەو گیاندارانەی کە ژەهریان هەیە, وتراویشە: هەر کەسێك کە نیەتی خراپ وچەپەڵی هەبێت. فتح الباري لابن حجر (٦/٤١٠).

(٢) لَامَّة: ئەوەیە کە لەمەمی هەبێت, ومەبەست پێی هەر نەخۆشی و ئافاتێکە کە تووشی مرۆڤ دەبێت. فتح الباري لابن حجر (٦/٤١٠).

(٣) كتاب أحاديث الأنبياء، رقم (٣٣٧١)، من حديث ابن عبَّاسٍ رضي الله عنهما.

## ئەوانەی کە سیحر کاریان تێ دەکات

ئەو کەسەی کە لەخواوە نزیکە ئافات و خراپەی لێوە دوورە، جا بۆیە کەسی نزیك لە خوا و زۆر زیکربێژ لە قەڵایەکی بتەوی پارێزەردایە لە خراپەی شەیتان و مرۆڤە شەیتان ئاساکان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴾ [الإسراء:٦٥] واتە: بێگومان بەندە باوەڕدارە موخلیصەکانم ئەوانەی گوێڕایەڵی منن تۆ هیچ توانایەکت نیە بۆ هەڵخەڵەتاندنیان وگومڕاکردنیان ، پەروەردگاری تۆش بەسە ــ ئەی پەیامبەری خوا ــ پارێزەری باوەڕداران بێت لە فێڵ وتەڵەکەی شەیتان وهەڵخەڵەتاندنەکانی .

جا ئەگەر بەندە دەستبەرداری زیکری خوا بوو یان خواپەرستی کەمی کرد بۆ پەروەردگاری ئەوا ئاسانتر بۆ شەیتان فریو دەدرێت و دەسەڵاتی زووتر بەسەریدا دەشکێت. ئەوەش لەبەر ئەوەی سیحر کار لە دڵە بەتاڵەکان دەکات، ئەو دڵەی کە بەتاڵە لە زیکری خوا بەزۆری.

پێشەوا ابن القيم بەڕەحمەت بێت دەڵێت: زۆرتر سیحر کار لە ئافرەتان و منداڵان و نەفامەکان و لادێ نشین دەکات ، ئەوانەی پشکیان کەمە لە دین و پشت بەخوا بەستن و یەکخواپەرستی ، هەروەها ئەوانەی کە بەشیان نییە لە زیکر و دوعا و ویردە شەرعیەکان[١] .

(١) زاد المعاد (١١٦/٤-١١٧).

بۆیە ئافرەتان زۆرترینی ئەو کەسانەن کە سیحر کاریگەریان لێ دەکات لەبەر کەم خواپەرستیان و کەم زیکر کردنیان بۆ خوا، هەروەها منداڵانیش لەبەر پشتگوێ خستنیان لەلایەن دایباب و سەرپەرشتیارانیانەوە، بەهەمان شێوە خراپەکاران و تاوانباران.

جا زۆرتریش ئەوانەی کە تووشی چاوپیسی و سیحر دەبن ئەوانەن کە ماڵەکانیان پڕە لە گۆرانی و مۆسیقا، ئەوەش لەبەر ئەوەی سیحر وچاوپیسی نەفسی پیسن و ئەوەش لە خوا دووربێت لە تاوانەوە نزیکە و کاریگەری لەسەری ئاسانە بە پێچەوانەی ئەو کەسەی کە خۆی پاراستووە و دڵی پڕە لە زیکر، تەنانەت شەیتان دەترسێت لەم جۆرە کەسە، خوای گەورە لەبارەی ئیبلیسەوە دەفەرموێت: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ۝٨٢ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾ [ص:٨٢-٨٣]. واتە: ئیبلیس ووتی : سوێند بە عیززەت و گەورەیی تۆ ئەی پەروەردگار دەبێت هەموو ئادەمیزاد گومڕا و سەرلێشێواو بکەم ، جگە لەوانە نەبێت کە تایبەتت کردوون بۆ خواپەرستی خۆت ، و پاراستوونت لە گومڕاکردنەکەی من ـ واتە : عیصمەتت پێداوون ـ ، و دەسەڵاتت پێ نەداوم بەسەریاندا .

***

## سیحر بە چ شتێك دەكرێت و ئەنجام دەدرێت؟

سیحر بە چەند ڕێگایەك دەكرێت وەكو ئەمانەی خوارەوە:

١ - سیحر لە ڕێگەی خواردنەوە، بەوەی كە سیحرەكە دەكرێتە ناو خواردنەكەوە و كەسەكەش دەیخوات و هەستی پێ ناكات و كاریگەریش لەسەری دروست دەكات بەئیزنی خوا و جاری واش هەیە بەفەرمانی خوا كاریگەری نابێت.

٢ - سیحر لەڕێگەی خواردنەوەوە، بەوەی كە سیحرلێكراوەكە ئەو شلەیە دەخواتەوە كە سیحرەكەی تێكراوە لە چایی یان شەربەت و هاوشێوەكانی. سیحر لە ڕێگەی خواردن و خواردنەوەوە ماددەیەكی لەزگەیی تێدەكرێت كە بە دیواری گەدەوە دەلكێت، بۆ ئەوەی ئەو سیحرە لەناو سك و هەناوی سیحرلێكراو بمێنێتەوە، جا ئەگەر سیحرلێكراو فریای خۆی نەكەوێت بەوەی دەری بكات بەڕشانەوە و هەڵهێنانەوەی ئەوا سك و هەناوی تووشی ئازار دەبێت و زیانی پێ دەگەیەنێت.

٣ - سیحر لەڕێگەی پرژاندن ودانانەوە، بەوەی كە سیحرەكە لەشوێنێك لەسەر زەوی دادەنرێت بۆ ئەوەی كەسی مەبەست پێی پێدا بنێت، جا ئەگەر پێی پێدا ناو بەسەریدا ڕۆیشت ئەوا تووش دەبێت و جاری واش هەیە بەئیزنی خوا كاریگەری نابێت و خوا دەیپارێزێت.

٤ - سیحر لەڕێگەی نووسینەوەوە بە تەڵەسم و هێڵکاریەکەوە بەبێ هیچ پاشماوەیەکی سیحرلێکراو، و ئەم جۆرەش بەئیزنی خوا کاریگەری لەسەر کەسی مەبەست کەم و لاوازە، چونکە هەر دەبێت شتێکی سیحرلێکراو لەبەردەستدا هەبێت.

٥ - سیحر لەڕێگەی گرێدانەوە، بەوەی کە ساحیر شتێکی لە کەسی سیحرلێکراوەکە دەست دەکەوێت لە موو یان بەشێك لە جلوبەرگەکەی و پاشان دەزوولەیەکی لەسەر گرێ دەدات و دوای ئەوەش بە هەناسەی پیسی فووی پێدا دەکات.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم جۆرە سیحری لێکرا لەڕێگەی تاڵی مووی سەریەوە سیحری لێکراو و پاشان سیحرەکە لە ناو (جُفِّ[1])دا هەڵگیرا لە ناو ئەو بەرگ و توێژاڵەی کە خورمای تێدایە و دواتریش فڕێ درایە ناو بیرەوە، وەکو لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە[2].

(١) الجُفُّ:ئەو بەشەی دارخورمایە کە تەڵع بەشی سەرەوەیەتی. النهاية في غريب الحديث والأثر (٢٧٨/١).

(٢) سبق تخريجه (ص١٠).

## شێوازی ناسینەوەی شوێنی سیحر

شوێنی سیحر بە دوو شێوازی شەرعی دەزانرێت و دەدۆزرێتەوە:

١ - یان بە دان پێدانان و هەواڵدانی ئەو جنۆکەیەی کە پاسەوانی ئەو سیحرەیە لە جەستەی سیحرلێکراوەکەدا، ئەوەش دوای قورئان خوێندن بەسەریدا، ئەویش شوێنی سیحرەکە ئاشکرا دەکات و دەردەهێنرێت.

٢ - وە یاخود خوای گەورە بە فەزڵی خۆی شوێنی سیحرەکە لە خەوندا پیشانی سیحرلێکراوەکە دەدات و ئەمیش دواتر کە بەئاگاهاتەوە دەچێت دەری دەهێنێت.

Ba_Kurty

## دوو هۆکار بۆ نەهێشتنی سیحر و لابردنی

١ - دوعا و پاڕانەوە لای خوا بۆ هەڵوەشاندنەوەی سیحرەکە، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وەها خەیاڵی دەکرد کە شتێکی کردووە و لەڕاستیشدا نەیکردبوو، هەتا ڕۆژێك یان شەوێك پێغەمبەری خوا دوعای کرد و هەر دوعای کرد... متَّفقٌ عليه[1]؛ خوای گەورەش وەڵامی دوعاکەی دایەوە.

دەبێت لە دوعاکەشدا سووربوون و بەردەوامی تێدابێت واتە - إلحاح - و پەیوەست بێت بە ئادابەکانی دوعاوە لە ڕووکردنە قیبلە و گەڕان بەدوای کاتەکانی گیرابوونی دوعادا وەکو سێ یەکی کۆتایی شەو، چونکە خوای گەورە لەو کاتەدا دەفەرموێت: «مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ وَمَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ وَمَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟» متَّفقٌ عليه[2] واتە: کێ هەیە دوعا بکات بۆ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە؟ کێ هەیە داوام لێ بکات بۆ ئەوەی پێی ببەخشم؟ وە کێ هەیە داوای لێخۆشبوونم لێ بکات بۆ ئەوەی لێی خۆش ببم؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ فِي اللَّيْلِ لَسَاعَةً لَا يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ، يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْراً مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ؛ إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ، وَذَلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ»

---

(١) سبق تخريجه (ص١٠).

(٢) رواه البخاري، كتاب التَّهجُّد، باب الدُّعاء في الصَّلاة من آخِرِ اللَّيل، رقم (١١٤٥)، ومسلم، كتاب صلاة المسافرين وقصْرها، باب التَّرغيب في الدُّعاء والذِّكْر في آخِرِ اللَّيل، والإجابة فيه، رقم (٧٥٨)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

رواهُ مُسلمٌ[1] .واتە: لەشەودا کاتێك هەیە کە ئەوەندە گەورە و گرنگە شایەنی ئەوەیە بەندە بۆی هەستێت، و ئەو هەلە بقۆزێتەوە ، هیچ کەسێکی موسڵمان نییە کە لەو کاتەدا هەستێت و داوای خێری دونیا و دوارۆژ بکات ئیلا خوای پەروەردگار پێی دەبەخشێت ئەو ساتە لە هەموو شەوێکدا هەیە و تایبەت نییە بەشەوێك و لەشەوەکانی تردا نەبێت.

٢. زۆر دووبارەکردنەوەی اســـتغفار (داوای لێخۆشـــوون)، چونکە یەکێکە لەهۆ کارە کانی لابردنی ناخۆشـــی و بەڵا، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴾[نوح:١٠-١٢]. واتە: بە گەلەکەم ووت تەوبە بکەن لە بێباوەڕیتان ، پەروەردگار لێبووردەیە بۆ ئەو بەندانەی کە تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای . ئەگەر تەوبە بکەن و داوای لێخۆشبوون لە خوای پەروەردگار بکەن ئەوا پەیتا پەیتا لێزمە بارانتان بۆ دەبارێنێت ، وە ماڵ و مناڵتان زۆر دەکات ، وە دەتانکاتە خاوەن باخاتێك لەزەت لە جوانی و بەروبومەکەی ببینن ، وە چەندین ڕووبارتان پێدەبەخشـێت ، کە بەهۆیەوە ئاودێری کشـتوکاڵ و مەڕ و ماڵاتەکانتان دەکەن

(١) كتاب صلاة المسافرين وقصْرها، باب في اللّيل ساعة مُستجاب فيها الدُّعاء، رقم (٧٥٧)، من حديث جابر رضي الله عنه.

## ئەو ئایەتانەی کەبەسەر سیحرلێکراودا دەخوێنرێتەوە

خوای گەورە قورئانی کردۆتە شیفا بۆ نەخۆشیەکان، بەشێوەیەك کە هەر ئایەتێك لە قورئاندا شیفای تێدایە و چەندین ئایەتیش هەن کەبە ئیزنی خوای گەورە کاریگەریان هەیە لەسەر سیحر، لەوانەش:

١ - سورەتی فاتیحە، کە گەورەترین سورەتە لە قورئاندا. رواهُ البخاريُّ[١].

٢ - ئایەتی کورسی، کە گەورەترین ئایەتە لە قورئاندا. رواهُ مُسلمٌ[٢].

پێشەوا ابن القيم بەڕەحمەت بێت دەڵێت: شێخی ئیسلام بە ئایەتی کورسی چارەسەری نەخۆشی دەکرد و فەرمانیشی دەکرد بە خوێندنەوەی بەشێوەیەکی زۆر بۆ کەسی تووش بوو چارەسەری پێ بکات و هەروەها بە خوێندنی هەردوو سورەتی فەلەق و ناس[٣].

٣ - کۆتایی سورەتی بەقەرە، لەبەر فەرموودەی «مَنْ قَرَأَ بِالآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ البَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ؛ كَفَتَاهُ»[٤].

---

(١) كتاب تفسير القرآن، باب ما جاء في فاتحة الكتاب، رقم (٤٤٧٤)، من حديث أبي سعيد بن المُعَلَّى رضي الله عنه.

(٢) كتاب صلاة المسافرين وقصْرها، باب فضل سورة الكهف وآية الكرسي، رقم (٨١٠)، من حديث أُبَيِّ بن كَعْب رضي الله عنه.

(٣) زاد المعاد (٤/٦٣).

(٤) سبق تخريجه (ص٤٣).

٤ - ئەو ئایەتانەی باسی سیحر دەکەن لە سورەتی ئەعرافدا، کە بریتیە لە: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُوا۟ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُوا۟ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾[الأعراف:١١٧-١١٩].

٥ - چەند ئایەتێکی سورەتی یونس کە بریتین لە: ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِى بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾[یونس٧٩-٨٢].

٦ - چەند ئایەتێکی سورەتی طه کە بریتین لە: ﴿ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلْ أَلْقُوا۟ ۖ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓا۟ ۖ إِنَّمَا صَنَعُوا۟ كَيْدُ سَٰحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴾ [طه:٦٥-٦٩].

٧. خوێندنی هەردوو سورەتی فەلەق و ناس، وەکو عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: «كَانَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم إِذَا اشْتَكَى يَقْرَأُ عَلَى نَفْسِهِ بِالمُعَوِّذَاتِ وَيَنْفُثُ، فَلَمَّا اشْتَدَّ وَجَعُهُ كُنْتُ أَقْرَأُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُ بِيَدِهِ؛ رَجَاءَ بَرَكَتِهَا» متَّفقٌ عليه[١]. واتە: دایکە عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نەخۆش

(١) رواه البخاري، كتاب فضائل القرآن، باب فضل المُعوِّذات، رقم (٥٠١٦)، ومسلم، كتاب السَّلام، باب رُقية المريض بالمُعوِّذات والنَّفْث، رقم (٢١٩٢).

بکەو تایە ئەم دوو ســورەتەی دەخوێند، و فووی دەکرد (فوویەک تفێکی کەمی لەگەڵدا بێت)، جا کاتێك نەخۆشــیەکەی ســەختتر بوو، من بۆیم دەخوێند و بەدەستی خۆی پێیما دەهێنا بە ئومێدی فەڕوبەرەکەتی.

پێشەوا ابن کەسیر بەڕەحمەت بێت دەڵێت: بەسوودترین چارەسەرێك بەکاربهێنرێت بۆ لابردنی سیحر بریتیە لەوەی خوا دایبەزاندووە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆ لادانی سیحر کە بریتیە لە هەردوو سورەتی فەلەق و ناس ولەفەرموودەکەشدا دەفەرموێت: (لَمْ يَتَعَوَّذِ الْمُتَعَوِّذُونَ بِمِثْلِهِمَا)[1]،هەروەها خوێندنی ئایەتی کورسی چونکە دوورخەرەوەی شەیتانە[2].

(١) رواه النسائي، كتاب الاستعاذة، رقم (٥٤٣٢)، من حديث عُقْبَة بن عامر رضي الله عنه.

(٢) تفسير ابن كثير (٣٧٢/١).

## روقیە بە دوعا و زیکرە شەرعیەکان

١ - «اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ أَذْهِبِ البَاسَ، اشْفِهِ وَأَنْتَ الشَّافِي، لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَماً» متَّفقٌ عليه[١].

٢ - ئەو روقیەی کە جبریل سەلامی خوای لێ بێت کردی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە بریتیە لە «بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ، اللَّهُ يَشْفِيكَ، بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ» رواهُ مُسلمٌ[٢].

٣ - ئەو دوعایەی کەلەلای نەخۆشدا دەووترێت ولەوبارەیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يَعُودُ مَرِيضاً لَمْ يَحْضُرْ أَجَلُهُ فَيَقُولُ - سَبْعَ مَرَّاتٍ -: أَسْأَلُ اللَّهَ العَظِيمَ رَبَّ العَرْشِ العَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ؛ إِلَّا عُوفِيَ» رواهُ أحمدُ[٣]. واتە: هیچ موسڵمانێك نییە کە سەردانی نەخۆشێك بکات بەو مەرجەی نەخۆشی سەرەمەرگی نەبێت و حەوت جار بڵێت: أَسْأَلُ اللَّهَ العَظِيمَ رَبَّ العَرْشِ العَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ واتە: داوا لەخوای گەورەی خاوەن عەرشی گەورە دەکەم کە شیفات بدات، ئیللا چاك دەبێتەوە.

---

(١) رواه البخاري، كتاب الطِّبِّ، باب رُقية النَّبيِّ صلى الله عليه وسلم، رقم (٥٧٤٣)، ومسلم، كتاب السَّلام، باب استحباب رُقية المريض، رقم (٢١٩١)، من حديث عائشة رضي الله عنها.

(٢) كتاب السَّلام، باب الطِّبِّ والمرض والرُّقَى، رقم (٢١٨٦)، من حديث أبي سعيد الخُدريِّ رضي الله عنه.

(٣) في المسند، رقم (٢١٣٧)، من حديث ابن عبَّاسٍ رضي الله عنهما.

## شێوازی هەڵوەشاندنەوەی سیحر

سیحر جۆری زۆرە، بۆ هەر جۆرێك لە جۆرەکانی ڕێگەیەك هەیە بۆ بەتاڵ کردنەوەی و هەڵوەشاندنەوەی، وا لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

**یەکەم: ئەگەر سیحرەکە لە خواردن و خواردنەوەدا بوو ئەوا ڕێگای بەتاڵ کردنەوەی بەدەرکردنی دەبێت لە ڕێگەی پیسی کردنەوە یان ڕشانەوەوە.**

**وە ڕێگای دەرکردنیشی لەناو سکدا بەم شێوەیە دەبێت:**

١ - ئامادەکردنی نیو کیلۆ لە ڕووەکی سەنای مەکی ( کەلە دووکانی گژوگیادا دەفرۆشرێت).

٢ - بەئەندازەی دوو کوپ لەئاو بهێنە و بیکە ناو کتریەکەوە.

٣ - دوو مشتی پڕ لە ڕووەکی سەنای مەکی بکە ناو کتریەکەوە.

٤ - جا ئەو کتریەی کە ئاو و ڕووەکەکەی تێدایە بیخەسەر ئاگر و بیهێڵە هەتا دەکوڵێت نزیکەی سێ خولەك.

٥ - بەیانی کەلە خەو هەڵدەسیت بەساردی دوو کوپی لێ بخۆرەوە.

٦ - دوای خواردنەوەی دوو کوپەکە لێی ئەوجا نزیکەی چارەکێك بەپێ ڕێ بکە.

٧ - دوای خواردنەوەی ئاوی ڕووەکەکە خواردن نەخۆیت هەتا دوای چوار کاتژمێر، بۆ ئەوەی بەباشی کاریگەری دروست بکات.

٨ - کاتێك ئاوی ڕووەکەکە دەخۆیتەوە هەست بە ئازای ناوسك دەکەیت و ئەمەش ئاساییە بۆ ئەوەی ڕووەکەکە ئەو پاشەڕۆیانەی ناوسك هەمووی بکاتە دەرەوە.

٩ - ئەو کەسەی کە ڕووەکی سەنا دەخوات پێویستی بەوە هەیە سەرئاو بکات بۆ دانانی پاشەڕۆ لە ڕۆژی یەکەم و دووەم، هەرچەندە سیحرلێکراویش نەبێت.

١٠ - ئەگەر ئازارەکەی ناوسك بۆ ڕۆژی سێ یەم و چوارەم هەر بەردەوام بوو ئەوا یەکێکە لەنیشانەکانی بوونی سیحر لە سکدا.

١١ - لەو کاتەدا بەردەوام بە لەسەر خواردنەوەی ئاوی سەنا بەهەمان شێوازی پێشوو بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ.

١٢ - ئەگەر هەر ئازارەکە دوای تێپەڕبوونی هەفتەیەك بەردەوام بوو، ئەوا هەفتەیەکی تریشی بخەرە سەر و بەردەوام بە لە خواردنەوەی ئاوی سەنا.

١٣ - ئەگەر ئازارەکە نەما ئەوا بوەستە لە ڕۆیشتنی بەردەوامت بۆ سەرئاو چونکە ئیتر ئەوە نیشانەی لاچوونی سیحرەکەیە بە ئیزنی خوا.

ئا ئەم شێوەیە سیحری ناو خواردن و خواردنەوە بەتاڵ دەبێتەوە و پووچەڵ دەکرێتەوە بەئیزنی خوا.

**دووەم: ئەگەر سیحرەکە لەسەر پارچە کاغەزێك نووسرابێت، ئەوا چۆنێتی پووچەڵکردنەوەی بەم شێوەیە دەبێت:**

بەوە دەبێت کە ئەم پارچە کاغەزە لە ناو سوراحی یان هەر تێگرێکی تری پڕ لە ئاودا نقوم بکرێت هەتا شوێنەواری نووسینەکەی پێوە نامێنێت، پاشان پارچە کاغەزەکە بدڕێنرێت و فڕێ بدرێت ئەگەریش هەندێ شوێنەواری نووسینی پێوە مابێت و ئاوەکەش دەڕێژرێت.

**سێ یەم: ئەگەر سیحرەکە گرێدراو بوو – واتە لە موو یان دەزوو – ئەوا بەم شێوەیە پووچەڵ دەکرێتەوە:**

گرێکە بکرێتەوە، ئەگەر کرایەوە ئەوا دەزووەکە پارچە پارچە بکرێت و فڕێ بدرێتە هەر شوێنێکەوە.

**چوارەم: ئەگەر سیحرەکە بەڕێگەی پرژاندن بوو لە زەویدا، ئەوا چۆنێتی پووچەڵکردنەوەی بەم شێوەیە دەبێت:**

١ - پەرداخێکی ئاو دەهێنرێت و سورەتی فاتیحە وئایەتی کورسی و هەردوو سورەتی فەلەق و ناسی بەسەردا دەخوێنرێت.

٢ - ئەو ئاوە دەپرژێنرێتە ئەو شوێنەی کە سیحرەکەی تێدا پرژاوە.

٣ - ئەم کردارە سێ جار دووبارە بکەرەوە بە ئیزنی خوا کاریگەری سیحرەکە نامێنێت.

پێشەوا ابن القيم بەڕەحمەت بێت دەڵێت: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە چارەسەری سیحر بە دوو شێوەیە:

یەکەمیان: کە کاریگەرترینیانە بریتیە لە دەرکردنی سیحرەکە وبەتاڵ کردنەوەی وەکو بەصەحیحی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە[1].

دووەمیان: بەتاڵ کردنی ئەو شوێنەی کە زیانی سیحرەکەی پێ دەگات[2].

(١) سبق تخريجه (ص١٠).

(٢) زاد المعاد (١١٤/٤).

## دروست نییە سیحر لای ساحیر بەتاڵ بکرێتەوە

دروست نییە سیحر لای ساحیر پووچەڵ بکرێتەوە ئیتر هەڵوەشاندنەوەکەی بە سیحر بێت یان بەبێ سیحر، لەبەر چەند هۆکارێك:

١ - بەرەهایی دروست نییە بڕۆیت بۆ لای ساحیران، تەنانەت ئەگەر بۆ کاری تریش بێت جگە لە بەتاڵ کردنەوەی سیحر، ئیتر چۆن دروست و ڕێگەپێدراوە بۆ پووچەڵ کردنەوەی سیحر؟!

ساحیران هاوکاری لە شەیتانەکانەوە وەردەگرن بۆ بەتاڵ کردنەوەی سیحر و ئەمەش کوفرە. پێشەوا ابن القیم بەڕەحمەت بێت سەبارەت بە بەتاڵ کردنەوەی سیحر بەڕێگای حەرام دەڵێت: هەڵوەشاندنەوەی سیحر بە هەمان شێوەی خۆی ئەوە لە کردەوەی شەیتانە و ساحیر و سیحرلێکراو لە شەیتان نزیك دەبێتەوە بەو شتەی کە ئەو پێی خۆشە[١].

٢ - ساحیر تەنها لە خراپە پێك دێت و هیچ چاکە و باشەی تێدا نییەو سیحریش بەتاڵ ناکاتەوە ئیلا بەدرۆ نەبێت بەسەر سیحرلێکراوەوە یان بەفێڵێك بۆ پارەلێ سەندنی و تەنانەت هەندێ جاریش سەردەکێشێت بۆ دەست بردن بۆ ناموسی.

***

(١) إعلام الموقعين (٦/٥٥٨).

## سیحرلێکراو ستەم لێکراوە

ئەگەر بەندە ڕاست بکات لەگەڵ خوای خۆیدا، ئەوا خوای گەورە تاقی دەکاتەوە بەوەی کە چەندین دوژمنی بۆ دەسازێنێت لە شەیتان و مرۆڤەکان، و لەوبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ﴾ [الأنعام:١١٢]. واتە: هەروەکو چۆن تۆمان ـ ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ـ تاقیکردۆتەوە بە دوژمنانت لە هاوەڵبڕیاردەرانی گەلەکەت بەهەمان شێوە هەموو پەیامبەرانمان ـ سەلامی خوایان لەسەر بێت ـ تاقی کردۆتەوە بە دوژمنانێك لەیاخیبووانی مرۆڤ و جنۆکە ، هەندێکیان ئەو قسانە دەدەن بە گوێی هەندێکی تریاندا کە بەناڕەوایی ڕازاندویانەتەوە ، بۆ ئەوەی ئەو کەسەی گوێبیستی دەبێت هەڵبخەڵەتێت وفریوبخوات ، و لەڕێگای خوای پەروەردگار لابدەن و وێڵ ببن.

ئابەم شێوەیە شوێنکەوتوی پێغەمبەران تووشی بەڵا و تاقیکردنەوە دەبن، چونکە ئەگەر خوای پەروەردگار بیەوێت بەندەکەی پایەبەرز بکاتەوە وبڵندی بکاتەوە ئەوا تاقی دەکاتەوە، ئەوەتا پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: «مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُصِبْ مِنْهُ» رواهُ البخاريُّ[1]. واتە: ئەگەر خوا خێری بۆ هەرکەس بوێت ئەوا تووشی بەڵا و موسیبەتی دەکات.

---

(١) كتاب المرضى، باب ما جاء في كفَّارة المرَض، رقم (٥٦٤٥)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

جا ئەی سیحر لێکراو خەم مەخۆ لەسەر ئەوەی تووشت بووە لە سیحر، ئەوەتا تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ سیحری لێ کراوە، خوای پەروەردگار بەندە باوەڕدارەکەی تاقی دەکاتەوە بۆ ئەوەی نزیکی بخاتەوە لەخۆی.

پێشەوا ابن القیم بەڕەحمەت بێت دەڵێت: خوای پەروەردگار لەکاتی نەخۆش خستنی بەندەکەیدا ڕەحمی پێکردووە و خێری تووش کردووە و لەخۆی نزیك کردۆتەوە، بۆ ئەوەی دڵی بشکێنێت بەنەخۆشی، چونکە خوا لەگەڵ دڵ شکاواندایە و لای ئەوانە [1].

بێزار و تورە مەبە لە سەر ئەوەی تووشت بووە، و نارەحەت مەبە لە سەر شتێك کە خوا لەسەرتی نووسیوە، چونکە ئەکرێ ئەوە هۆکاری پلەبەرزکردنەوەت بێت، ئەوەتا خوای باڵادەست دەفەرموێت: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ﴾ [البقرة:٢١٦]. واتە: لەوانەیە هەندێك جار حەز لەشتانێك نەکەن کەچی لە ڕاستیدا خێری تێدابێ بۆتان ، و لەوانەشە هەندێك جار شتیانێکتان حەزلێبێت لەبەر ئەو ڕاحەتی و چێژە دوابڕاوە دونیایەی کە تێیدایە کەچی لە ڕاستیشدا خراپەی تێدایە بۆتان . بێگومان خوای بەرز و بڵند و پایەبەرزە کە دەزانێت چی خێر و چاکەی ئێوەی تێدایە ، بەڵام ئێوە ئەوە نازانن .

(١) شفاء العلیل (ص٢٥٥).

وە ئەگەریش شتێکی دونیاییت لەدەست چووە، ئەوا دڵنیابە ئەوەی لای خوایە خێرترە و دەمێنێتەوە و کاتی نییە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هەیە و کاروکردەوەی چاکە ئەنجام دەدەن و پشتیان بە پەروەردگاریان بەستووە، وەکو شێخی ئیسلام بەڕەحمەت بێت دەڵێت: کەسی ستەم لێکراو حەسوودی پێ براوە، جا بۆیە ئەگەر ئارام بگرێت و تەقوای خوای هەبێت ئەوا چارەنووس و دەرئەنجام بۆ ئەوە[١].

ئەم بڕگەیە زۆر دووبارە بکەرەوە: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ [البقرة:١٥٦]، اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي، وَأَخْلِفْ لِي خَيْراً مِنْهَا»

ئوم سەلەمە ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: مَا مِنْ مُسْلِمٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ، فَيَقُولُ مَا أَمَرَهُ اللَّهُ: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ ، اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي، وَأَخْلِفْ لِي خَيْراً مِنْهَا؛ إِلَّا أَخْلَفَ اللَّهُ لَهُ خَيْراً مِنْهَا، قَالَتْ: فَلَمَّا مَاتَ أَبُو سَلَمَةَ، قُلْتُ: أَيُّ الْمُسْلِمِينَ خَيْرٌ مِنْ أَبِي سَلَمَةَ؟! - أَوَّلُ بَيْتٍ هَاجَرَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم - ثُمَّ إِنِّي قُلْتُهَا، فَأَخْلَفَ اللَّهُ لِي رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم» رواهُ مُسلمٌ[٢].واتە: هەرکەسێك توشی بەڵایەك بێت و بڵێت: (إنا لله وإنا إليه راجعون)). [ئێمە هەر خوا خاوەنمانە و هەر بۆلای

(١) مجموع فتاوى شيخ الإسلام (٢٢/١٧).

(٢) كتاب الجنائز، باب ما يُقالُ عند المصيبة، رقم (٩١٨).

ئەویش دەگەڕێینەوە]. خوایە پاداشتم بدەرەوە لەسەر ئەو بەڵایەی توشم هاتوە و چاکتر لەوەی لێت سەندوم پێم ببەخشە، خوا پاداشتی چاکتری دەداتەوە و چاکتری پێ دەبەخشێت (أم سلمة) دەڵێت: کاتێ (أبوسلمة) وەفاتی کرد، من ئەوەم وت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێدام، ئیتر ئەوە بوو خوای گەورە هاوسەری لەو چاکتری پێ بەخشیم کە پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

وە خەم وپەژارەی دونیا ئەگەریش زۆربێت لەســەر موســڵمان ئەوا هەر ســـاتێك دێت کە نامێنێت و کۆتایی پێ دێت و دواتر خوای گەورە بۆی دەگۆڕێت بە خۆشی و نیعمەت و ئەوکات بەندە هەرچی ناخۆشی هەیە لەبیری دەچێتەوە، ئەوەتا پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: «يُؤْتَى بِأَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُصْـبَغُ فِي النَّارِ صَـبْغَةً، ثُمَّ يُقَالُ: يَا ابْنَ آدَمَ، هَلْ رَأَيْتَ خَيْراً قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ نَعِيمٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لَا وَاللَّهِ يَا رَبِّ، وَيُؤْتَى بِأَشَدِّ النَّاسِ بُؤْساً فِي الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيُصْـبَغُ صَـبْغَةً فِي الْجَنَّةِ، فَيُقَالُ لَهُ: يَا ابْنَ آدَمَ، هَلْ رَأَيْتَ بُؤْساً قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ شِدَّةٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لَا وَاللَّهِ يَا رَبِّ، مَا مَرَّ بِي بُؤْسٌ قَطُّ، وَلَا رَأَيْتُ شِـدَّةً قَطُّ» رواهُ مُسلمٌ[١]. واتە: بەختەوەرترینی کەس لە دۆزەخیەکان لە ڕۆژی قیامەتدا دەهێنرێت، یەکجار هەڵدەژەنرێت لە ئاگر پاشـــان پێی دەوترێت: ئەی نەوەی ئادەم ئایا هەرگیز خێر و خۆشـــیت دیوە، ئایا هەرگیز نیعمەتی خوا

(١) كتاب صفة القيامة والجنّة والنّار، باب صَبْغِ أَنْعَمِ أهل الدُّنيا في النّار وصَبْغِ أَشدِّهم بؤساً في الجنة، رقم (٢٨٠٧)، من حديث أنس بن مالك رضي الله عنه.

بەســـەر تا تێپەڕیووە؟ ئەویش دەڵێت: نەبەخوا ئەی پەروەد گار، ئینجا خێر لە خۆنەدیوترین کەسیش لە دونیادا لەبەهەشتیەکان دەهێنرێت یەکجار لە بەهەشتا هەڵدەژەنرێت پاشـان پێی دەوترێت: ئەی نەوەی ئادەم ئایا هەرگیز ناخۆشـیت بەخۆتەوە بینیوە، ئایا هەرگیز سەختیی بەسەرتا تێپەڕیووە، ئەویش دەڵێت: نەبەخوا ئەی پەروەردگار، هەرگیز ناخۆشیم لە ژیاندا نەدیوە، هەرگیز سەختیم نەدیوە.

وە دڵنیابە ئەو کەسە ستەمکارەی کە ڕۆیشتووە بۆ لای ساحیر بۆ ئەوەی سیحرت لێ بکات لە چنگی خوا ڕزگاری نابێت و دەربازی نابێت، خوای تۆ لە بۆسەدایە بۆی و لەوبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴾ [المؤمنون:١٧]. واتە: هەرگیز ئێمە لەبارەی دروست کراوەکان بێئاگا نین ، و لە هیچ دروستکراوێك بێئاگا نابین .

ئەی سیحرلێکراو ئەگەر تۆ بچیتە پێشدەست و بەردەمی خوای میهرەبان بەستەملێکراویەوە باشترە بۆت لەوەی بە ستەمکاریەوە بڕۆیتە بەردەمی.

جا بۆیە پەنا بەخوا بگرە و لێی بپاڕێرەوە و زۆر استغفار بکە و دڵنیابە رزگاربوون و دەربازبوونت نزیکە و هەرگیز نەکەیت بێ ئومێد وبێ هیوابیت و مەوەستە لە بەکارهێنانی هۆکارەکانی بەتاڵ کردنەوەی سیحر لە دوعا و چارەسەری دەرمانی حەڵاڵ وخۆت بەدەستەوە مەدە و فێڵی شەیتان لاوازە و خوای گەورە پشت وپەنای باوەڕدارانە و بێباوەڕان پشت وپەنایان نییە و خوای باڵادەست فەرموویەتی: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَأَنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ ﴾ [محمد:١١].

واتە: ئەوەی هێنامان بەسەر هەردوو کۆمەڵەکەدا : کۆمەڵی باوەڕداران و کۆمەڵەی بێباوەڕان ، هۆکارەکەی ئەوەیە کە خوای پەروەردگار پشت و پەنا و سەرخەری باوەڕدارانە ، و بێباوەڕانیش نە پشت و پەنا و نە یارمەتیدەر و نەسەرخەریان هەیە .

وە خوای گەورە هێز و دەسەڵاتی هەیە و کەسی ستەمکاریش هەرچەندە زوڵم و تاوان بکات ئەوا خوای گەورە لەسەرووی ئەوەوەیە و هەرکات بیگرێت بەشێوەیەك سزای دەدا کە دەرفەتی دەربازبوونی نەبێت و دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ [إبراهيم:٤٢]. واتە: هەرگیز وا گومان مەبە ـ ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ـ کە خوا بێئاگایە لەوەی کە ستەمکاران دەیکەن.

***

## کاهن کێیە؟

**کاهن:** کەسێکە لافی ئەوە لێ دەدات کە ئەوەی ڕوو دەدات لە ئایندەدا دەیزانێت، بۆ نمونە: دەڵێت دەزانم فلانە کەس کەی دەمرێت و ئایا فلانە کەس خۆش دەژێت یان ناخۆش و هاوشێوەی ئەم شتانە.

جا ئەم جۆرە کەسە لافی زانینی شتێك لێ دەدات کە فریشتە و پێغەمبەرانیش نایزانن، چونکە زانستی غەیب تەنها خوای گەورە دەیزانێت و لەوبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾ [النمل:٦٥] واتە: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ پێیان بڵێ : هیچ کەسێك لە ئاسمانەکان وزەویدا نیە کە پەی بەزانست وزانینی نادیاری خوا ببات ، و ئاگای لە غەیب هەبێت ، وە ناشزانن کەی زیندوو دەکرێنەوە لە گۆڕەکانیان لەڕۆژی دواییدا ؟

هەروەها لەبارەی خۆیەوە فەرموویەتی: ﴿ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ [التغابن:١٨]. واتە: هەر ئەویشـــە زانایە بە هەموو پەنهانی و بەرچاوییەکان ، و توانا و باڵادەستێکە کە هەرگیز نادۆڕێت ، کارجوان و دانایە لە گوفتار و کردارەکانی .

وە بابەتی بورجەکانیش کە بورجی بەختی پێ دەڵێن جۆرێکە لە جۆرەکانی جادووگەری.

## حەقیقەتی کاهنەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ بە فەرمایشتێکی کورت وپوخت حەقیقەتی کاهنەکانی بۆمان ڕوون کردۆتەوە کاتێك پرسیاری ئەوانی لێ دەکرێت ئەویش دەفەرمویێت: «لَيْسُوا بِشَيْءٍ» متَّفقٌ عليه[١] .واتە: هیچ نین.

شێخی ئیسلام بەڕەحمەت بێت دەڵێت: ئەستێرەوان و جادووگەران وفاڵچیان و هاوشێوەکانیان نەزانی و نەفامی و گومڕایی و درۆ و شتی مەحاڵیان ئەوەندە لایە کە تەنها خوای گەورە دەتوانێت بیزانێت و بیژمێرێت[٢] .

کلیلەکانی زانستی غەیب هەمووی بەدەستی خوای تاك و تەنهایە و خەڵکیش درۆی جادووگەران دەزانن، بەڵام کەسانی ئیمان لاواز وزاڵ بوونی شەیتان بەسەریاندا تووشی تاوان و سەرپێچی کردوون.

شێخی ئیسلام بەڕەحمەت بێت دەڵێت: خەڵکانی تایبەت و گشتی بە ئەزموون و هەواڵ ئەوەیان بۆ دەرکەوتووە کە ئەو حوکم و هەواڵانەی ئەستێرەوانان و جادووگەران دەیڵێن درۆ تێیاندا چەند قاتی ڕاستیە[٣] .

---

(١) رواه البخاري، كتاب الأدب، باب قول الرَّجُل للشَّيء: ليس بشَيءٍ، وهو يَنْوِي أنَّه ليس بحقٍّ، رقم (٦٢١٣)، ومسلم، كتاب السَّلام، باب تحريم الكِهَانة وإتيان الكهَّان، رقم (٢٢٢٨)، من حديث عائشة رضي الله عنها.

(٢) درء تعارض العقل والنَّقل (٥/٦٧).

(٣) مجموع فتاوى شيخ الإسلام (٣٥/١٧٢).

## فێڵی کاهنەکان

کاهنەکان فێڵی زۆریان هەیە کە بەکاری دەهێنن بۆ ئەو کەسانەی کە دەڕۆن بۆ لایان بۆ ئەوەی فریویان بدەن گوایا ئەوان زانستی غەیب دەزانن ولەوانەش:

ئەگەر یەکێك بڕوات بۆ لایان وپرسیاری داهاتوو بکات ئەوا شتانێکی پێ دەڵێن کە گشتیە وبۆ هەموو کەسێك ڕوودەدات وەکو ئەوەی پێی دەڵێن: خەم وپەژارەیەکت تووش دەبێت وپاشان نامێنێت، چونکە دەزانن کە خەم وپەژارە درێژە ناکێشێت و دەڕوات.

یان پێی دەڵێن لەئایندەدا رزق ورۆزیەکت دەست دەکەوێت وئەوەش دەزانن کە خوای گەورە رزقی هەموو دروست کراوەکانی دەدات.

یان پێی دەڵێن لەئایندەدا هەواڵێکی خۆش دەبیستیت لەژیانتدا کە خۆشحاڵت دەکات ئەوەش لەبەر ئەوەی چاك دەزانن کە مرۆڤ لەژیانیدا تووشی خۆشی و ناخۆشیش دەبێت.

ئیتر هاوشێوەی ئەم قسانە کە زۆرێکی لە خەڵکی پێ هەڵدەخەڵەتێت.

## درۆی کاهنەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی ئەوەی داوە کە کاهن سەد درۆ دەکات لەگەڵ یەك هەواڵدا کە دەستی دەکەوێت، وەکو دەفەرموێت: «حَتَّى يُلْقِيَهَا عَلَى لِسَانِ السَّاحِرِ أَوِ الكَاهِنِ... فَيَكْذِبُ مَعَهَا مِئَةَ كَذْبَةٍ» متَّفقٌ عليه[(١)]. واتە: ئەو جنۆکەیەی کە هەواڵەکە لەئاسمان دەدزێت دەیگەیەنێت بە دەمی ساحیر و کاهنەکە و ئەمیش سەد درۆی تێکەڵ دەکات لەگەڵیدا.

جا لەڕاستیدا ئەگەر تۆ هاوڕێیەکت هەبێت کە تەنها لەیەك هەواڵدا پێنج درۆ بکات ئەوا بەدڵنیاییەوە لێی دووردەکەویتەوە و هاوەڵێتی ناکەیت، چونکە تۆ وا گومان دەبەیت کە گاڵتە بە عەقڵت دەکات، ئیتر چۆن بڕوا دەکەیت یان دەچیت بۆ لای کەسێك کە سەد درۆ دەکات نەوەك پێنج؟! ئایا ئەمەیان شایستەتر نییە بەوەی لێی دووربکەویتەوە هەم لەخۆی و هەمیش لە کاروکردەوەکانی؟!

(١) رواه البخاري، كتاب تفسير القرآن، باب ﴿حَتَّى إِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا الحَقَّ وَهُوَ العَلِيُّ الكَبِيرُ﴾، رقم (٤٨٠٠)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه، ومسلم بنحوه، كتاب السَّلام، باب تحريم الكِهَانَة وإتيان الكهَّان، رقم (٢٢٢٨)، من حديث عائشة رضي الله عنها.

## بەڵگەی درۆکانیان

ئەگەر کاهن وەکو لافی ئەوە لێ دەدات زانستی غەیب بزانێت ئەوا هەموو ئەو شەڕ و خراپانەی کە دادەبەزن لەخۆی دووردەخاتەوە و کاتی مردن و مەرگی خۆی دەزانێت و بەوهۆیەوە تۆبە دەکات وپەشیمان دەبێتەوە پێش ئەوەی بمرێت و رۆحی دەربچێت بۆ ئەوەی نەچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

جا ئەگەر جنۆکەکان کە لافی زانینی پەنهانی و غەیب لێ دەدەن ڕاست و هاوکاری ساحیران دەکەن ڕاست بڵێن ئەدی بۆچی نەیانزانی پێغەمبەر سولەیمان سەلامی خوای لێ بێت وەفاتی کردووە هەتا زیندەوەرەی خۆرە گۆچانەکەی خوارد لە خوارەوە و ئەمیش کەوتەسەر زەوی ئەوجا زانیان کە مردووە؟ وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ الْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِ إِلَّا دَابَّةُ الْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ الْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ ﴾ [سبإ:١٤]. واتە: جا کاتێك کە بڕیاری مردنی سولەیمانماندا جنۆکەکان نەیانزانی مردووە بە هۆی مۆرانەوە نەبێت کە لەگۆچانەکەیان دەخوارد کە خۆی دابوو بەسەریدا ، و بەو هۆیەوە سولەیمان کەوتە سەر زەوی ، لەو کاتەدا جنۆکەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەگەر غەیب وپەنهانیان زانیبایە ئەوا لەو نارەحەتی و سەرشۆڕی و کارە قورسانەدا نە دەمانەوە بۆ سولەیمان ، کە گومانیان وابوو ئەو هێشتا زیندووە . ئەم ئایەتە بەڵگەی پووچەڵکاری ئەو بیروباوەڕەیە کە هەندێك خەڵکی تێدایە کە گوایا جنۆکە پەنهان دەزانن .

## دان پێدانانی کاهنێك لەبەردەم شێخی ئیسلامدا

کەسی درۆزن هەرچەندە ڕۆبچێت لە درۆکەیدا هەر ڕۆژێك دێت کارەکە ئاشکرا بێت، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ الصِّدْقَ طُمَأْنِينَةٌ، وَإِنَّ الكَذِبَ رِيبَةٌ» رواهُ التِّرمذيُّ[1]. واتە: ڕاستگۆیی دڵئارامیە و درۆیش دڵەڕاوکێیە.

جا کاهن لافی ئەوە لێ دەدات کەبەشدارە لەگەڵ خوادا لەزانینی زانستی غەیبدا و پێغەمبەریش خواش ﷺ هەواڵی ئەوە دەدات کە هەرکەس بانگەشەی زانینی غەیب بکات یان بانگەشەی ئەوە بکات کە شتێکی هەیە و لەکاتێکدا نیەتی ئەوا خوای گەورە ئاشکرای دەکات و ئابڕووی دەبات وەکو دەفەرموێت: «الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ كَلَابِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ» متَّفقٌ عليه[2]. واتە: ئەو کەسەی خۆی هەڵبکێشێ بەماڵێکەوە کە نەیدرابێتێ وەك ئەو کەسە وایە کە قاتێکی درۆینەی پۆشیبێ.

ئەوەتا کاهنێك دان بەدرۆکانیدا دەنێت لەسەردەمی شێخی ئیسلامدا بەوەی درۆی بۆ خەڵکی کردووە وەکو شێخی ئیسلام دەڵێت: بەهەمان شێوەی ئەوان کەسانی ئەستێرەناسیش درۆ دەکەن تەنانەت کاتێك من لەگەڵیاندا قسەم کرد لە دیمەشق و سەرۆك و گەورەکانیان لەلام ئامادەبوون و خراپی و چەپەڵی ئەو

---

(١) أبواب صفة القيامة والرَّقائق والورع، رقم (٢٥١٨)، من حديث الحسن بن عليٍّ رضي الله عنهما.
(٢) رواه البخاري، كتاب النِّكاح، رقم (٥٢١٩)، ومسلم، كتاب اللِّباس والزِّينة، باب النَّهي عن التَّزوير في اللِّباس وغيره والتَّشبُّع بما لم يُعطَ، رقم (٢١٣٠)، من حديث أسماء رضي الله عنها.

کاروکردەوەیەیانم ڕوون کردەوە وئاشکراکرد بەبەڵگەی عەقڵی کە خۆیان دان بەڕاستێیاندا دەنێن ئەوەبوو یەکێك لە گەورەکانیان وتی: سوێند بەخوا ئێمە سەد درۆ دەکەین هەتا وشەیەکی ڕاست دەڵێین[1] .

جا ئەگەر کاهنەکان دان بەوەدا دەنێن کە نەك تەنها درۆ بەڵکو درۆیەکی زۆر وبێ شومار دەکەن، ئیتر بۆچی خەڵکی دەڕوات بۆ لایان؟! لەکاتێکدا هیچیان لا دەست ناکەوێت لایاندا جگە لە درۆ و بوهتان و تاوان نەبێت؟

(١) مجموع فتاوى شيخ الإسلام (١٧٢/٣٥).

## حوکمی ڕۆیشتن بۆ لای کاهنەکان

١- هەرکەس بڕوات بۆ لای کاهن و بڕوای پێ بکات ئەوا کوفری کردووە و ئەو کەسەش کە ناولەپ دەخوێنێتەوە دەگرێتەوە، وەکو پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَتَى عَرَّافاً أَوْ كَاهِناً، فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ؛ فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ صلى الله عليه وسلم» رواهُ الحاكمُ[(١)]. واتە: ئەوەی بچێتە لای ساحیر و جادووگەرێك و قسەکەی بەڕاست بزانێت ئەوا کوفری کردووە بەوەی دابەزێنراوە بۆ محمد (واتە : بە قورئان).

٢- هەرکەس بڕوات بۆ لای کاهن بۆ خۆشی نەوەك بۆ پرسیارکردنیش ئەوا حەرامە و دروست نییە، ئەوەتا موعاویەی کوڕی حەکەمی سولەمی رضي الله عنه دەڵێت: «يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ، وَقَدْ جَاءَ اللَّهُ بِالإِسْلَامِ، وَإِنَّ مِنَّا رِجَالاً يَأْتُونَ الكُهَّانَ، قَالَ: فَلَا تَأْتِهِمْ» رواهُ مُسلمٌ[(٢)]. واتە: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم من نزیکم لەسەردەمی نەفامیەوە واتە تازە موسڵمان بوومە، خوای گەورە ئیسلامی هێنا، لەناو ئێمەدا کەسانێك دەچوونە لای فاڵچیەکان، فەرمووی: (تۆ مەچۆ بۆ لایان).

***

(١) في المستدرك (٤٩/١)، رقم (١٥)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

(٢) كتاب المساجد ومواضع الصَّلاة، باب تحريم الكلام في الصَّلاة، ونسخ ما كان من إباحته، رقم (٥٣٧).

## عەڕاف کێیە؟

**عەڕاف:** کەسێکە لافی زانینی ئەو شتانە دەدات کە بەچاو نابینرێن وەکو زانینی بوونی ئەو شتەی کەلە پشت دیوارێکەوەیە و فڵانەکەس چی دەکات لەم ساتەدا لەکاتێکدا ئەو کەسە لەشارێکی ترە و بەم شێوەیە....[1].

(١) شرح السُّنَّة للبغوي (١٨٢/١٢).

## حوكمی ڕۆیشتن بۆ لای عەرافەكان

١.هەركەس بچێت بۆ لای عەرافێك و بڕوا بەوە بكات كە دەیڵێت ئەوا كوفری كردووە وەكو دەفەرموێت: «مَنْ أَتى عَرَّافاً أَوْ كَاهِناً، فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ؛ فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ صلى الله عليه وسلم» رواهُ الحاكمُ[1]. واتە: ئەوەی بچێتە لای ساحیر و جادووگەرێك و قسەكەی بەڕاست بزانێت ئەوا كوفری كردووە بەوەی دابەزێنراوە بۆ محمد.

٢. هەركەس بچێت بۆ لای عەرافێك تەنها بۆ پرسیاركردن و باوەڕیشی پێ نەكات ئەوا نوێژی چل شەوی لێ وەرناگیرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ أَتى عَرَّافاً فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً» رواهُ مُسلمٌ[2]. واتە: هەركەس بچێتە لای فاڵچی یەك و پرسیاری شتێكی لێ بكات چل شەو نوێژی لێ وەرناگیرێت.

***

(١) سبق تخريجه (ص٧٨).

(٢) كتاب السَّلام، باب تحريم الكِهَانة وإتيان الكُهَّان، رقم (٢٢٣٠)، من حديث صَفيَّة رضي الله عنها.

# ئەستێرەناس ( المنُجِّمُ) ، وَالرَّمَّالُ، وَالضَّارِبُ بِالحَصَى، لەپخوێنەرەوە و فاڵگرەوە

## پێناسەی ئەو کەسانە:

**المُنَجِّمُ :** ئەو کەسەیە کە حیسابی ئەستێرەکان دەکاتە هۆکارێك بۆ گەیشتن بە مەبەست و ئامانجی حەرام[١] .

**الرَّمَّالُ** : ئەو کەسەیە هێڵ لەزەوی و بەسەر لمدا دەکێشێت وبەوە لافی زانینی زانستی غەیب دەدات[٢] .

**الضَّارِبُ بِالحَصَى** ئەو کەسەیە کە وردە بەرد بەسەر یەکتردا دەکێشێت گوایە بەوە زانستی غەیب وپەنهانی لێ دەردەهێنێت[٣] .

**لەپ خوێنەرەوە وفاڵگرەوە:** کەسێکە ورتەورت دەکات بەسەر ناولەپی مرۆڤ و فنجانە و کوپدا بە وشەگەلێکی نارِوون و بەوە لافی زانینی غەیب لێدەدات.

جا هەموو ئەوانەی کە باسیان کرا گشتیان لە هۆکارەکانی شەیتانن و کاهن و فاڵچی و جادووگەران بەکاریان دەهێنن و بانگەشەی زانینی غەیبی پێ دەکەن و ئەوەش درۆیەکی ڕوون و دیارە.

هەندێ جاریش کەسێکی تر بەناوی " **المُشَعْوِذُ** " هەمان کار دەکات وەکو لاسایی کردنەوەی جادووگەر و فاڵچی بۆ ئەوەی ماڵی خەڵکی بەنارەوا ببات.

***

(١) معالم السُّنن (٢٢٩/٤-٢٣٠)، مجموع فتاوى شيخ الإسلام (١٩٢/٣٥).
(٢) المفاتيح في شرح المصابيح (١٨١/٢).
(٣) معالم السُّنن (٢٣١/٤)، نخب الأفكار (١٠٩/١٤).

## (المُشَعْوِذُ) کێیە؟

المُشَعْوِذُ : کەسێکە بانگەشەی ئەوە دەکات کە ساحیرە یان کاهنە و درۆش دەکات لەوەدا. مەبەستیشی ئەوەیە ماڵ وسامانی خەڵك ببات و بخوات وسیحر دەکات وچارەسەری خەڵك دەکات و غەیب دەزانێت و ئاوەهاش نییە و ناشزانێت وەکو ئەوان جوڵە و چالاکی ئەنجام بدات بەڵکو تەنها لاساییان دەکاتەوە و خۆی بەوان دەچوێنێت[(١)].

بۆیە دروست نییە موسڵمان بچێت بۆ لایان چونکە کەسێکی درۆزنە.

(١) المحكم والمحيط الأعظم (٣٥٤/١)، مجموع فتاوى شيخ الإسلام (٤٩٦/١١).

## جیاوازی نێوان السَّاحِرِ، والكَاهِنِ، والعَرَّافِ، والمُشَعْوِذِ

السَّاحِرُ : کەسێکە کە سیحر دەکات وبەئیزنی خوا کاریگەری دەبێت لەسەر کەسی سیحر لێکراو.

الكَاهِنُ: کەسێکە لافی زانینی ئەوە لێ دەدات کە لە داهاتوودا ڕوودەدات، وەکو ئەوەی دەڵێت: فڵانە کەس دوای دوومانگی تر دەمرێت و هاوشێوەی ئەم قسانە.

العَرَّافُ : کەسێکە کە لافی زانینی ئەو شتانە لێ دەدات کە لەپێش چاو نین نەوەك ئەوەی لە ئایندەدا ڕوودەدات، وەکو ئەوەی هەواڵ بدات کە کێ لەپشتی ئەو دیوارەوەیە یان ئێستا کێ لەناو ئەو ئۆتۆمبیلەدایە لەشارێکی تر.

المُشَعْوِذُ: کەسێکی درۆزنە و سیحر نازانێت و خۆی بەوان دەچوێنێت بۆ خواردنی ماڵی خەڵکی و کەسانی ساویلکە فریو دەدات.

***

## بانگەوازێك بۆ تۆبەکردن

هەرکەس بچێت بۆ لای کاهن وساحیران و لەدەرگایان بدات ئەوا خۆی تەرخان کردووە بۆ زیان گەیاندن بەوانی تر، بۆیە با دەست لەو تاوانە هەڵبگرێت و وازبهێنێت لە تێکدانی ژیانی خەڵکی تر وپەشیمان بێتەوە لەو کارەی کردوویەتی و بگەڕێتەوە بۆ لای خوا و دەست بە داوای لێخۆشبوون بکات و کردەوەی چاکە ئەنجام بدات چونکە خوای میهرەبان فەرموویەتی: ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ﴾ [طه:٨٢]. واتە: هەر منم کە لێبوردەم لەبەرامبەر ئەو کەسەی کە تۆبە بکات لەتاوان وبێباوەڕیەکەی ، و باوەڕ پێبێنێت وکردەوەی چاك ئەنجام بدات ، و پاشان ڕێگای ڕەوایی دۆزیبێتەوە وشوێنی کەوتبێت وبەردەوام بێت لەسەری .

جا کاتێك ساحیرەکانی فیرعەون تۆبەیان کرد و باوەڕیان هێنا خوای گەورە تۆبەکەیانی لێ وەرگرت وپلەشیانی بەرزکردەوە و بوون بە شوێنکەوتەی موسا سەلامی خوای لێ بێت.

بۆیە ڕێچکەی تۆبەکاران بگرە و ڕێگای بێ ئومێدان بەردە لەساحیران جادووگەران.

لەخوای گەورە داواکارم موسڵمانان بپارێزێت لە کاروکردەوەی ساحیرە تێکدەرەکان و شیفای بەپەلەی سیحرلێکراوانیش بدات و پاداشتی خێریان بداتەوە لەسەر ئەو موسیبەتەی تووشیان بووە.

وصلَّى اللَّهُ علىَ نَبيِّنا مُحمَّدٍ، وعلىَ آلِهِ وصَحبِهِ وسلَّمَ.

***

# ناوەڕۆک